# تورکیا لە دووڕیانی



# دەسەڵاتی ژەنەڕاڵەکان و



# دەسەڵاتی سیاسییەکاندا



دلشاد مەجید

هەولێر ١٩٩٥

دلشاد مەجید

# تورکیا لە دووریانی دەسەڵاتی ژەنەراڵەکان و دەسەڵاتی سیاسییەکاندا

١٩٩٥

ـ توركیا لەدووریانی دەسەلاتی ژەنەراڵەکانو دەسەلاتی سیاسی یەکاندا
ـ لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی
ـ دلشاد مەجید
ـ ١٩٩٥ ـ هەولێر
ـ تیراژ (٥٠٠) دانە
ـ پیت چنین «کۆمپیوتەری کوردستانی نوێ»
ـ بەرگ ، چاپخانەی رەنگاڵە

فوتوستێنسل، نوسینگەی ویران

# ئەم نووسینە

لەدروستبوونی کۆماری تورکیاوە تا ئەمرۆ، راستەوخۆ و ناراستەوخۆ توێژی بەرفراوانی عەسکەرییە گۆشکراوەکان بە ئەتاتورکیزم (کەمالیەت)، ئیدارەی وڵاتەکە دەدەن و رەوت و ئاقارە بناغەییەکانی سیاسەتی تورکیا، لە ئاستە ناوخۆیی و ئیقلیمی و جیهانییەکان ئاراستە دەکەن. دەیان هۆکاری مێژوویی و سۆسیۆلۆژی و جیۆپۆلەتیکی و بگرە کەلتووری ئەو دەرەتانەیان بۆ عەسکەرییەکان خۆشکردووە تا هەمیشە ئەو هەقە بە خۆیان بدەن و سەرجەم رەوتە سیاسیە رەسمیەکانیش بە شێرازی جۆراوجۆر بە دوای خۆیاندا پەلکێش بکەن.

بۆیە کە سیستمی جووت جەمسەری لە دنیادا هەڵوەشایەوە و ئەوەی پێی دەڵێن سیستمی نوێی جیهان هاتە ئاراوە و هاوکاتیش رەوتی هەوڵدانی تورکیا بۆ تێکەڵبوونی بە ئەورووپا و سیستمی ئابووری ئەورووپا توندتر و فراوانتر بوو، پرسیارێك سەری هەڵدا کە دەڵێ: داخۆ تورکیا، بەو زەهنیەتە عەسکەرتاییە سیاسییەی دەتوانێ ببێتە بەشێکی ئاشنا و کاریگەر لە جەستەی ئەم دنیایە نوێیەدا؟

ئەم نووسینە بە دیدی شیکردنەوەی مێژوویی یەوە بە دوای وەڵامەکەیدا دەگەڕێ، لە میانی ئەو گەڕانەیدا نووسەر ئەو هۆکارە زاتی و مەوزوعیانەکان بۆ دەست نیشان دەکا کە بە درێژایی مێژووی خەلافەتی عوسمانی و کۆماری تورکیا، بوونەتە هۆی بەرخوداربوونی سوپا وەك پێکهاتەیەکی گرنگی دەوڵەت و عەسکەرییەکان وەك توێژێکی کۆمەڵایەتی، بەو دەسەڵاتە فراوان و کاریگەرە بەکلاکەرەوەیەی کە لە دروستکردنی بریاری سیاسی تورکیادا هەیانە.

بەدەربڕینێکی جیاوازتر، نووسەر، نامۆنەبوونی تورکیا بەدنیای نوێ بەوەوە دەبەستێتەوە داخۆ تاچەند ئەو کۆمارە علمانیە مشەوەهە فرەنەتەوەو مەزهەبە دوو کیشوەرییە پڕ لەکێشەی نەتەوەیی و ئابووری دەتوانێ جل و بەرگی خاکی ئەتاتورکیزم لەخۆی دابماڵێ و بۆ کێشە دیموکراتیەکانی . بەکێشەی نەتەوە چەوساوەکانیشەوە ڕێگاو شێوازی جیاواز لەپێشینەی مێژوویی و کەلتووری سیاسی ئەو وڵاتە بگرێتە بەر.

ئەوەی لێرەدا دەبێ ئامازەی بۆ بکرێ ئەوەیە کە خۆمان لەو تێگەیشتنە هەڵە یە دوور بخەینەوە کە وەفاداری بۆ ئەتاتورکیزم تەنیا بەژەنەراڵە عەسکەرییەکانەوە بەند بکا ، وەك ئەوەی نووسەر بۆی چووە. چونکە ئەمە سەرجەم تێگەیشتنمان لەرەوتی داهاتووی تورکیا ئیفلیج دەکا ، بۆیە دوا دەرەنجامی نووسەر لای من زۆر دروست ناکەوێتەوە . چونکە ژەنەراڵەکان لەداهاتووی بەرچاودا لەدروستکردنی بڕیاری سیاسی تورکیادا ڕۆڵی بەرچاویان هەردەمێنێ و گۆڕیسی پچڕکێنەکەش ، ئەگەر بەشێوەی دایلۆگی سیاسی شارستانیانەش بێ . لەخێزان ژەنەراڵەکان و سیاسیەکاندا نابێ (وەك لەناونیشانی نووسینەکە بەدەردەکەوێ). بەڵکو لەنێوان تێگەیشتنی مۆدرێن و تێگەیشتنی کەمالیانە دەبێ بۆ چەمکی دەوڵەت و سەرەنجام بۆ چەمکی تورکیاییکی بەهێزو کاریگەرو خاوەن خەونی فراوانتر لەسنوورەکانی تورکیای ئێستاو پەل هاویشتو بۆ سەرجەم دنیای (تورکی فۆن)

ئەم نووسینەی کاك دڵشاد، لەپاڵ هەندێ کەموکوری مەنهەجی و زاڵبوونی شێوازی مەقالەی ڕۆژنامەگەری و ئەوساش کێماسی زمانەوانی کارێکی باش و هەوڵێکی بەجێیە بەتایبەت بۆ ئەم قۆناغە کە دەبێ ڕووناکبیرانی کورد هەرچی زووترو زۆرتر بەمەسەلە پەیوەستەکانی تورکیا ئاگاداربن . دەست خۆشانەی لێ دەکەم .

**ئازاد جندیانی**

تێبینی :ـ

ئەم نووسینەی کاك ئازاد جندیانی لەجیاتی پێشەکی تەنیا بۆبابەتی یەکەم نووسراوە .

بابەتی یەکەم

# تورکیا لە دووریانی دەسەڵاتی ژەنەراڵەکان و دەسەڵاتی سیاسییەکاندا

سوپاو دامەزراوی سەربازی. لە پاڵ بنەما سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی و جیوپۆلیتیکەکانی هەر دەوڵەتێك، لەو بنەما بەهێزو سەرەکیانەن کە ئەو دەوڵەتەی لەسەر دادەمەزرێ، بۆ ئەوەی چوارچێوەو قەوارەی ئەو کیانە لە هەر هێزێکی دەستدرێژکەری ئەو دیوو سنورەکان و ئەو تاقم و گروپە ناوخۆییانەی دەوڵەت لە سەر قەوارەکەی خۆی بە مەترسییان دەزانێ، بپارێزێ، یان ببێتە ئامرازێك بۆ پەلهاوێشتن و چاولێسوورکردنەوەو بەجێ هێنانی ئامانجە سیاسی و جیوپۆلیتیکەکانی ئەو دەوڵەتە، دژ بە وڵاتانی دەوروبەری، هەروەها وەك گوشارێکی سیاسی کاریگەر بە کاریبهێنێ بۆ جێ بەجێ کردنی مەرامە سیاسی و ئابوورییەکانی خۆی: جا هەر لەم روانگەیەوە دەتوانین هەلسەنگاندنێکی ئەمرۆی رەوتی ملیتاری وڵاتێکی وەك تورکیا بکەین و بزانین بۆچی ژەنەراڵە عەسکەرییەکانی ئەمروی تورك وەك تاکە هێزێکی سیاسی عەسکەری باڵادەست، چارەنووس و ئایندەو بریاری سیاسی تورکیایان بەدەستە؟ چ شتێك سیاسیەکانی تورکیای کردۆتە پاشکۆو ملکەچی بریارو فەرمانەکانی ئەو دامودەزگایە؟ جا بەمەبەستی بەدیهێنانی وەلامێکی مەنتیقی بو ئەم پرسیارو لێکدانەوانە. ئەم باسەو لێکۆلینەوەیە لەدایك بوو، تا لەو روانگەو پێوەدانگەوەش لەعەقلی سیاسی وخیتابی سیاسی دوێنێ و ئەمرۆی تورکەکان بگەین.

بەلام ئەوەی راستی بێ ئەم رولەی ئەمروی عەسکەرتاریەت لە ژیانی سیاسی تورکەکان دەیبینی، هەروا لە خوت و خورایی، یا وەك پێداویستیەکی مەرحەلی دروست نەبووە. بەلکو زەمینە مێژوویەکەی بۆ سروشتی ژیانی خێلایەتی و دواتر سەرەتای دروست بوونی دەوڵەتی عوسمانیەکان دەگەرێتەوە.

## ئیمپراتوریەتی عوسمانی ... پێکهاتەیەکی سەربازی بوو نەك شارستانی!

هەروەك لەسەرەتادا ئاماژەمان بۆ کرد، ئەم رولەی ئەمرۆ عەسکەر لە ژیانی سیاسی تورکیای نوێدا دەیگێرێ، زەمینەیەکی مێژوویی هەیەو بو سەرەتای دروست بونی دەوڵەتی عوسمانی دەگەرێتەوە. یا ووردتر بلێین بو سروشتی عوسمانییەکان وەك خێلێکی شەرکەر دەگەرێتەوە. عوسمانیەکان پێش ئەوەی ئەو ئیمپراتوریەتە گەورەیە لە ئەنادۆل دامەزرێنن. خێلێکی کوچەری سەربازی و جەنگاوەری بوون و لە ناوچەی خوراسانی روژهەلاتی ئێران لەترسی هێرشی مەغولەکان لە نێوان سالانی (١٢١٩_١٢٣٥) روویان لە ئەنازۆل کرد، ئەو کاتەش ناوچەی ئەنازول هەندیکی لە ژێر دەسەلاتی میرنشینە سەلجووقیە تورکمانە ئیسلامی یەکان بوو. هەندیکی تریشی لە ژێر دەسەلاتی ئیمپراتوریەتی بیزانت دا

بوو (١٤/١)، به حوکمی ئه وه ی سه لجووقیه کان تیره یه کی شارستانی تورکمانه کان بوون، عوسمانیه کان به هوی هاوره گه زیه وه توانیان خویان له گه ل سه لجوقیه کان بگونجینن، هه ر ئه و فاکته ره ش بوو، وای له عوسمانیه کان کرد، که بینه ژیر باری ئایینی ئیسلامه وه، وه ببنه هیزیکی زه بر وه شینی ده وله تی ئیسلامی و له چوارچیوه ی له شکری ئیسلام په ره به (فتوحاتی) ئیسلامی بده ن له ئه ورووپا، یه کیك له خاسیه ته کانی زوربه ی خیله کوچه ریه کان سه رقال بوونه به ژیانی شه روشور، تا له و ریگایه وه زیاتر زه وی زارو له وه رگای باش بو مه رو مالاته کانی خیله که یان دابین بکه ن، بی گومان ئه مه ش ده بیته مایه ی رووبه رووبونه وه له گه ل ئه و کومه له شارستانیانه ی که له ناوچه که دا جیگیرن. هه ر بویه له وانه یه سه لجوقیه کان له ترسی ئاژاوه نانه وه ی عوسمانیه کان له ناوچه کانیاندا، هه رزوو دركیان به و مه ترسیه کردبیت. بویه ده رگای کشان به ره و ژوور بو ناو ئه ورووپایان به رووی عوسمانیه کان والاکردبیته وه، هه ر شوینیکیشیان داگیرکردبی، له لایه ن سه لجوقیه کانه وه ته واوی ده سه لاتی ئیداری و عه سکه ریان پی به خشراوه، ئه مه ش بووه مایه ی به ده ست هینانی پله و پایه ی به رز له ناو له شکری ئیسلام و ده وله تی ئیسلام و حه زکردنی زیاتر به فراوان کردنی ده سه لاتیان دوای ئه وه ی عوسمانیه کان له ناوچه ی ئه نازول، له نزیك که ناری گه رووی بسفوری ئیستا، له ناو جه رگه ی میرنشینه مه سیحیه کانی سه ر به ئیمپراتوریه تی بیزانت و به رامبه ر به پایته ختی قوسته نتینه ی بیزه نته کان جیگیربوون، سه ره تای ره وتی سه ربازی عوسمانیه کان لیره وه ده ست پی ده کات. عوسمانیه کان له کاتی جیگیربوونیان له ناوچه که و تا سالی (١٣٥٩) توانیان ده سه لاتی ته واوی خویان به سه ر میرنشینه مه سیحیه کان (کرمیان، صاروخان، مه نتشا ،قره سی) ناوبانی ئه نادول دابگرن و ته واوی که ناره کانی ئه م دیو و ئه و دیوی هه ردوو گه رووی بسفورو ده رده نیل له سه ر ده ریای ره ش و سپی داگیربکه ن. پاشان عوسمانیه کان له نیوان سالانی (١٣٥٩ـ١٣٨٩) توانیان بپه رنه وه که ناره کانی ئه و دیوی ئه ورووپاو له ناوچه ی گالیبولی جیگیربین و ئه و ناوچه یه ش بکه نه بنکه یه ك بو په لاماردان و کاره سه ربازیه کانیان بو ناو جه رگه ی ئه ورووپا. دوای ئه وه ی ناوچه ی (تراقیان) داگیرکرد، عوسمانیه کان یه کسه ر پایته ختی خویان له ئه نازوله وه گواسته وه (ئه درنه). گواستنه وه ی پایته خت بو ئه و دیوی به شی ئه ورووپا به قوناغیکی نویترو سه ره تایه کی گرنگ ده ژمیردری، بو زیاتر په لهاویشتنی عوسمانیه کان بو ناوچه کانی ئه ورووپا، بویه پاش ئه و قوناغ داکوتانه ی عوسمانیه کان له به شی ئه ورووپا، توانیان شاره کانی (تراقیاو مه قدونیاو بلغاریا) یه ك له دوای یه ك داگیربکه ن. هه روه ها له سالی (١٣٨٩) توانیان ته واوی ولاتی سربه کانیش بخه نه ژیر چه پوکی خویان.

له هه مان کاتیشدا عوسمانیه کان ته واوی میرنشینه کانی خوارووی ئه نازولیان

داگیرکرد، بەم شێوەیە لەنێوان سالانی (١٣٨٩_١٤٠٢) عوسمانیەکان سەرەتاو بنەمای ئیمپراتوریەتەکەیان هەر لە ئەنازولەوە تا بەلقان داکوتا (١٨/١)، لە ئەنجامی ئەم فراوانخوازیەدا عوسمانیەکان، خویان رووبەرووی ئیمپراتوریەتی بیزانت بینیەوە، لە ئەنجامدا عوسمانیەکان لەسالی (١٤٥٣) توانیان ئیمپراتوریەتی بیزانت برووخێنن و دەست بەسەر (قوستەنتین)ی پایتەختدا بگرن و ئەو شارە ناوبنێن (ئیسلام پۆل) واتە شاری ئیسلامەکان، کە ئیستا بە (ئەستانبول) ناسراوە، کارە جەنگیەکانی عوسمانیەکان هەر لە ئەستانبول نەوەستا بەلکو توانیان ناوچەکانی رۆمانیاو کەنارەکانی سەروو رۆژهەلاتی دەریای رەش لە ولاتی رووسەکان داگیربکەن و، دواتریش بەرەو ناوەراست و رۆژئاوای ئەوروپا بکشێن، بەلام دوای دووجار گەمارۆدانی ڤیەننای پایتەختی نەمساو سەرنەکەوتنیان لەو دوو پەلامارە، بووە مایەی ئەوەی کە چیتر عوسمانیەکان نەتوانن زیاتر بەرەو ئەوروپا پەلبهاوێن و بەرەو رۆژهەلات بگەرێنەوە، ئەو بەلادا شکانەوەی عوسمانیەکانیش بەرەو رۆژهەلات بو دوو هوی گرنگ دەگەرێتەوە، یەکەمیان سەرهەلدانی دەولەتی سەفەوی لە ئیرانی ئیستاو دوزینەوە جوگرافیەکانی (الاستكشافات الجغرافية) بورتوگال و ئیسپانیەکان لە ناوچەکانی رۆژهەلاتدا لە کۆتایی سەدەی پانزەهەم. عوسمانیەکان لەو بەرەیەشدا توانیان لەنێوان سالانی (١٥١٤_١٦٤٨) لە ریگای سەرکەوتنە عەسکەریە یەك لە دوای یەکەکانیان لە چالدێران و مەرجەدابق ریردانیە و شەری بینۆن(١) تەواوی دەسەلاتی سیاسی و عەسکەری خۆیان بەسەر ولاتی عەرەبی و کوردستان و بەشێکی ولاتی فارس دا بگرن، هەروەها لە سالی (١٥١٧) کاتی سولتان سەلیمی یەکەم میسری داگیرکرد، توانی (محمد المتوكل) دوا خەلیفەی عەباسیەکان بەدیل بگریت و بیهێنیتەوە ئەستانبول (٦٣/١)، لەو رۆژەوە عوسمانیەکان خۆیان بە میراتگری دەولەتی ئیسلامی داناو (خەلافەش) گواسترایەوە بۆ بنەمالەکەیان، واتە لێرە بۆمان دەردەکەویت، دەولەتی عوسمانی بە حوکمی ئەو هەموو شەروشورەی، هەلکەوتەیەکی عەسکەری بوو، زیاتر لەوەی هەلکەوتەیەکی شارستانی بیت کە بەزەبری هێزوتوانای سەربازی، لە پال فاکتەری ئایین توانیان ئەو دەسەلاتە سیاسی و عەسکەریە زەبەلاحەی خۆیان بەسەر ئەو ناوچە فراوانەدا بچەسپێنیت و تا جەنگی جیهانی یەکەم بەردەوام بێ، بۆیە لێرەدا دەتوانین بلێین عوسمانیەکان (گەلێکی شەرکەری سەربازی بوون)، هەروەك نووسەرو سیاسی تورك دکتور حکمت قفلجە میلی ئاماژەی بو دەکات و دەلێن (زاراوەی نەتەوەی شەرکەرو سەربازی هاوجووتی سەرجەم نەتەوەی توورکە) (١١/١٧_١٢)، هەر بویەش کاتی دەولەتی عوسمانی هەستی بە شلوقی و لاوازی کردبێ، ئەو لاوازیەی لە بێ هێزی و کەم توانایی سوپاکەی بەرجەستە کراوە، یا بە پیچەوانەوە، بۆیە زوربەی سولتانەکانی دوای سەدەی شانزەهەمی دەولەتی عوسمانی، بێ هێزی

ده وله تیان ، له بن هیزی سوپای (ئینکشاریه)(۲) به دی کردووه ، دوای ئه وه ی ئه و سوپا شیواز ده ره به گی یه نه یتوانیوه خۆی له به رامبه ر سوپای مودێرن و خاوه ن دیسپلینی ئه وروپی یه کان رابگری ، بویه سولتان محمودی دووه م توانی له (١٦/ جوزه یرانی ١٨٢٦) سوپای ئینکشاریه ره ت بکاته وه و سوپایه کی نوێتر له سه ر شیوازی ئه وروپایی دابمه زرێنی (١٨٣/١)، به مه به ستی پته وکردنی ریزه کانی سوپاو به خشینی زانیاری عه سکه ری نوێ ، چه ندین دانیشگاو خویندنگاو کولیژی سه ربازی کرانه وه ، بو ئه وه ی ئه فسه رو ده ره جه دارانی سوپا زانیاری نوێ و ئه کادیمیانه وه ربگرن ، ئه و دانیشگاو کولیژو مه لبه ندی مه شق پی کردنانه ش ، له لایه ن ئه فسه رو ماموستایانی عه سکه ری ئه وروپی یه به ریوه ده چوون . هه رچه نده ئه م ریفورمانه تاراده یه ك بوونه مایه ی به هیزکردنی سوپای عوسمانی ، به لام ژیان و هه لس و که وت و بیرو ئایدولوژیای ئه وروپیانه ، له ریگای ئه و چاپه مه نیه فه ره نسی و ئینگلیزی و ئه لمانیانه ، به شیوه یه کی زور کاریگه ر کاری له بیروبوچوونی ئه فسه ره گه نجه کانی عوسمانی کرد ، ئه مه ش بووه سه ره تایه ك بو چه که ره کردنی نفوزی سیاسی ئه وروپایی یه کان له نیو سوپادا به تایبه تی و له نیو عوسمانیه کان دا به گشتی ،

## که‌ی بیرۆکه‌ی ئه‌ورو‌پایی کردنی تورکیا له‌ نێو سوپا سه‌ری هه‌لدا؟!

عوسمانیه کان له ئه نجامی په یره وکردنی سیسته می کۆنی ده ره به گایه تی سه ربازی ، چه ندین شکستی سه ربازیانه یان له به رامبه ر هیزه مودێرنه کانی سه ربازی ئه وروپیه کان به خۆوه بینی ، ئه نجامی ئه و شکستانه ش ، چه ندین ریکه وتننامه ی سازشکارانه و خۆیه ده سته وه دانی به دواداهات . عومسانیه کان له سالی ١٦٩٩ له ئه نجامی مورکردنی په یمانی (کارلوفتزی) ده ستبه رداری ولاتی (مه جر) بوون بو نه مساوییه کان هه روه ها له سالی ١٧١٧ له ریگای په یمانی (بساروفتز) عوسمانیه کان چه ندین ناوچه ی به لقانیان له ده ست دا ، جگه له وه شکسته سه ربازییه کانی ده وله تی عوسمانی له به رامبه ر رووسه کان ، بووه مایه ی مورکردنی هه ردوو په یمانی (کوجك کنیارجی ــ ١٧٧٤) و (په یمانی یاس ــ ١٧٩١) ، هه روه ها عوسمانیه کان له سالی (١٧٩٨ــ١٨٠١) نه یانتوانی هیچ به رگرییه کی ئه وتو به رامبه ر به سوپای فه ره نسیه کان بنوێنن ، ئه مه ش بووه مایه ی داگیرکردنی سوریاو میسرو فه له ستین له لایه ن فه ره نسیه کانه وه بو ماوه یه ك (١٧٧/١) ئه م شکسته سه ربازیانه وای له ده وله تی عوسمانی کرد ، که له ناوه راستی سه ده ی هه ژده هه م ، چاویك به سیسته می ئیدارات و باری ئابووری و دامووده زگای سوپادا بخشینیته وه و له ریگای کومه لیك ریفورمی ئابووری و ئیداری و سیاسی و عه سکه ری گیان به جه سته ی خاموشی ده وله تدا بکه نه وه ، به لام چونیه تی پراکتیکه کردن و

شێوازی ریفورمەکان خۆی لە دوو بۆچوونی جیاوازدا ساغ دەکردەوە. یەکەمیان گەڕانەوە بۆ سیستەم و نزامی ئیسلامی و عادات و عورفی خەسلەتی کۆنە عوسمانیەکان بوو، دووەمیان خۆی لە پەیرەوکردنی شێوازی ئەورووپیانە دەدۆزیەوە، هەڵگرانی بۆچوونی یەکەم خۆی لە پیاوانی ئاینی و دەرەبەگەکان و مەلاکەکان دەدۆزیەوە، تاقمی دووەمیش خۆی لە ژەنەراڵە عەسکەریەکان و چینی تازە پێگەیشتووی بورجوازی و روشنبیران و هەندێک لە سولتانەکانی دەدوزیەوە، هەرچەندە ئەم دوو بۆچوونە تاریخانی دەولەتی عوسمانی و تورکیای نوێ لە ململانێدان، بەلام تاقمی دووەم توانیان وەك زەرورەتێکی ئەو کاتە بوچوونەکانی خۆیان بەسەر دەسەلاتدارانی عوسمانی بسەپێنن. لەپال ئەوەش ئەورووپیەکان هاوجووت لەگەل ئەو تاقمە نویخوازە هەولی پراکتیکەکردن و سەرکەوتنی ئەو بۆچوونەیان دەدا، تا لەو ریگایەوە بتوانن بخزینە نیو داموده زگای ئیمپراتوریەتە لە رزۆك و نەخوشەکە. کاتیکیش لە سەردەمی سولتان سەلیمی سێیەم (١٧٧٩_١٨٠٧) گلوپی سەوز بو ئەورووپیەکان داگیرسا، بە خوشحالیەوە رژانە نیو پەیمانگاو خویندنگاو کولیژە سەربازییە تازەکانی عوسمانی، فەرەنسیەکان پشکی گەورەیان لەو ریگە پێدانە بەرکەوت و پیشەنگی ئەورووپیەکان بوون، دواتریش ئەلمان و نەمساو ئینگلیزەکانیش بە ریژەی جیاجیا خۆیان خزاندە نیو داموده زگا تازە دامەزراوەکانی سوپاو ئیداراتی عوسمانی. ئەوە بوو سەرەتا چەندین خوێندنگاو دانیشگای عەسکەری بە زمانی فەرەنسی کرانەوە، دوابەدوای ئەوەش زمانی ئینگلیزی بووە دووەمین زمانی سەرەکی نیو ئەوخویندنگایانە. لەو خویندنگایانەدا ماموستاو فیرکەرە ئەورووپیەکان، لە پال بەخشینی زانستی عەسکەری بیرو هزرو چونیەتی ژیانی سیاسی ئەورووپیەکانیشیان دەرخواردی میشکی ئەفسەرەکانی دەولەتی عوسمانی دەدا، بویە سەیر نی یە ئەگەر بیروباوەری شورشی فەرەنسی لە چوارچیوەی بنەماکانی (ئازادی و یەکسانی و دیموکراتی) زوو گەیشتبێتە نیو هاولاتیانی عوسمانی (٨٠/١) چونکە ئەفسەرە خویندکارەکان، لە پال خویندنەوەی کتیبی زانستی عەسکەری، خویان سەرقالی خویندنەوەی ئەو کتیبە فەرەنسیانەش دەکرد، کە باسی لە ژیانی سیاسی فەرەنساو ئایدیولوژیای سیاسی ئەورووپیەکان دەکرد بەگشتی. جگە لەمەش کەناڵە دبلوماسیەکانی ئەورووپاش لە ئەستانبول و ئەو دبلوماتیکە عوسمانیانەی لە پایتەختەکانی ئەورووپا نوینەرایەتی دەولەتیان دەکرد، دەوری کاریگەریان هەبوو لە چەکەرەکردنی بیروهزری ئەورووپیانە لە نیو عوسمانیەکاندا، بو نمونە (رشید پاشا) گەورە دبلوماسی عوسمانیەکان لە پاریس و لەندەن، وای لە سلطان عبدالمجید (١٨٣٩_١٨٦١) کرد، کە هەردوو مەرسوومی (خەتی شەریف گولخانە لە سالی ١٨٣٩) و (خەتی شەریف هەمایون لە سالی ١٨٥٦) بە بیانووی پاراستنی مەسیحیەکانی نیو ئیمپراتوریەتی عوسمانی

له چه وسانه وه ی ئاینی و نه ته وایه تی و کارکردن له مه ودوا به یاسا دانراوه کان (الوضعیة) له جیاتی یاسا ئاسمانیه کان و به رپاکردنی دادوه ری و یه کسانی له نیو هاوولاتی و نه ته وه کانی نیو ده وله تی عوسمانی. ده ربکات، هه روه ها روشنبیرانی عوسمانی و ئه فسه رانی سوپا له پال گوشاری ئه وروپیه کان، بو زیاتر به ئه نجام گه یاندنی ریفورمه کان وایان له سلطان عبدالعزیز (١٨٦١ـ١٨٧٦) کرد، که نیمچه په رله مانیك به ناوی (ئه نجومه نی شورای ده وله ت) دابمه زرینی و ریگا زیاتر بو کاری روژنامه گه ری خوشتر بکات. به لام دوای ئه وه ی ئه م سولتانه گیانی خوسه پاندنی تیدا زال بوو، سوپا له شه وی (٣٠ ئاداری ١٨٧٦) هه لی کوتایه سه ری و له سه رته خت هینایه خواره وه و سولتان عه بدول حه میدی (١٨٧٦ـ١٩٠٩) یان له جیگا دانا. به مه رجی ده بیت سولتانی نوی هه ولی دارشتنی ده ستوریکی نوی بدات بو ده وله تی عسمانی، سولتانی نوییش له (٢٣ کانونی یه که می ١٨٧٦) ده ستوری عوسمانی له سه رشیوازی ده ستوری به لجیکی له (١١٩) ماده راگه یاند. به لام کاتی سولتان عه بدول حه مید، به مه به ستی داسه پاندنی ده سه لاتی تاك ره وی خوی له (١٤ شوباتی ١٨٧٨) به یانیکی ده رکردو، به گویره ی ئه و به یانه په رله مانی هه لوه شانده وه ده ستووری ده وله ت راگیرا. ئه مجاره یان دیسانه وه ئه فسه رانی سوپاو روشنبیران. له ریگای هه ردوو کومه له ی (تورکیای لاو) ی روشنبیران و کومه له ی (ئیتحادو ته ره قی) ئه فسه ران، روژی (٢٣ ته موزی ١٩٠٨) کوده تایه کی سه ربازییان دژی سولتانی ناوبراو به رپاکرد و ناچاریان کرد، که جاریکی تر کار به ده ستووری (١٨٧٦) بکاته وه. هه رچه نده سولتان عه بدول حه مید له (١٣ نیسانی ١٩٠٩) دا له ریگای شورشیکی چه واشه دا، هه ولی دا جاریکی تر ده ستورو په رله مان له کاربخا. به لام ئه و کاره ی بووه مایه ی هینانه خواره وه ی سولتان له سه رته ختی سولتانایه تی، جا له چوارچیوه ی ئه و ململانییه ی نیوان روشنبیران و ئه فسه رانی سوپا له لایه ك و ده سه لاتدارانی کونخوازی عوسمانی له لایه کی تر ده گه ینه دوو ده رئه نجام :ـ

١. ره نگدانه وه ی بیروهزری ئه وروپیه کان له نیو سوپا به تایبه تی، له نیو روشنبیران به گشتی. زیادبوونی نفوزی ئه وروپییه کان له نیو ئه و دوو تاقمه.

٢. بالاده ستی سوپا، له سه پاندنی مه رجه سیاسیه کانی به سه ر سیاسیه کانی ده وله ت هه ر کاتی سولتان و سیاسیه کان ریگر بونایه له به رده م ئه و بۆچوونانه ی سوپا به تایبه تی له سه رته خت لادراون.

واته لیره دا ده رده که ویت، که سه ره تای به روژئاوایی بوونی تورکه کان بو سه رده می عوسمانیه کان ده گه ریته وه، نه ك بۆ سه رده می ئه تاتورك. به لام به حوکمی ئه وه ی ئه تاتورك وه ك نوینه ری سوپا ده سه لاتی سیاسی ولاتی که وته ده ست (ئه مه یان یه که م جاره له میژووی ده وله تی عوسمانی، ئه فسه ریکی سه ربازی ده سه لاتی سیاسی بگریته ده ست. به بی ئه وه ی له بنه ماله ی

عوسمانیه کان بێت و له خه لکی ئاسایی ولات بێت)

ئه م خه ونه دێرینه ی عه سکه ره کانی هێنایه دی، لێره دا ده وری ئه تاتورك ته نیا پراکتیکه کردنی بیرۆکه ی به رۆژئاوایی بوون بوو، جیا له ئه نجامی خستنه رووی ده سه لاتی سیاسی عه سکه ره کانی ده وله تی عوسمانی، ده گه ینه ئه و راستیه، که ئیستا سوپا به هه مان شیوازی سه رده می ده وله تی عوسمانی، ده وری کاریگه ر ده گێری له ژیانی سیاسی تورکه کان، هه ر سێ کوده تاکه ی (١٩٦٠، ١٩٧١، ١٩٨٠) شایه دی ئه و راستیه ن و ئه و دوو ده ره نجامه ی سه ره وه شیان، زور به ئاسانایی تیا به رجه سته ده کرێن. جگه له مه رایه کی تر هه یه، که ده وله تی عوسمانی به هوی په لهاویشتنی بو نیو ئه وروپا و به سه ربردنی ژیانێکی (٧) سه ده یی له گه ل ئه وروپیه کان، عوسمانیه کان به ولاتیکی ئه وروپی ده خه نه روو، ئیستاش زوربه ی رووناکبیران و نوسه رانی علمانی تورك ئه وروپایی بوونی خویان بو ئه و سه رده مه ده گه رێننه وه. به لام حوکمرانی کردنی (٧) سه ده ی موسلمانه کان به ناوی (خه لافه تی) ئیسلامی و به موسلمان بوونی (٩٥٪) ی دانیشتوانی تورکیاو ئه هامه تی ئه وروپیه ئیسلامی به کان له به شی ئه وروپا، بۆ به ئیسلام بوونی خویان ده گه رێننه وه. ئه م رایه به دوور ده خه نه وه، جیا بۆ زیاتر چوونه نێو باسه که. هه ول ده ده ین ئه و دوو ده رئه نجامه ی که پێشتر ئاماژه مان بۆ کرد له سه رده می تورکیای نوێ بخه ینه روو:

# ره نگدانه وه ی نفوزی سیاسی ئه ورو پی یه کان له نێو سوپای ئه تاتۆرکدا

ولاتانی ئه وروپی به گشتی، به ریتانیا و فه ره نسا به تایبه تی، هه ولیکی بێ وچانیاندا، بۆ هه لوه شاندنه وه و له به ر یه کترازاندنی ئیمبراتۆریه تی عوسمانی، بۆ ئه و مه به سته ش گشت جۆره گوشارێك و رێگایه کیان گرته به ر، هه ر له به کارهێنانی گوشاری ئابووری و سیاسی و رۆشنبیری، تا به کارهێنانی هێزی سه ربازی. ئه وروپاییه کان له سێ رێگاوه ده ست بخه نه ناوکاروباری ده وله تی عوسمانیه وه:

١ ـ له رێگای جێ به جێ کردنی ریفورمه کانی ده وله تی عوسمانی، زوربه ی ئه وروپیه کان خۆیان خزانده نێو دام و ده زگا گرنگه کانی ده وله ت.

٢ ـ له رێگای که مه نه ته وایه تی و ئاینیه کانی نێو ده وله تی عوسمانی، که له و

رێگایه وه ئه وروپیه کان به بیانووی دابین کردنی مافی ئایینی و نه ته وایه تی ئه و که مه نه ته وایه تی و ئاینیانه وه ، توانیان نفوزی سیاسی خۆیان له ناو ئه و خه لکانه دا زیاد بکه ن .

٣ ـ له رێگای وه رگرتنی ئیمتیازاتی ئابووری له ده وله تی عوسمانی ، توانیان ده سه لاتی ته واو به سه ر بواره ئابوورییه کانی ولاتدا دابگرن و پاشانیش به هۆی سه رمایه که یانه وه (تحکم) له ئابووری ده وله ت بکه ن . هه روه ها ببێته مایه ی سه رهه لدانی چینێکی پاره داری مۆنۆپۆلی گرێدراو به به رژه وه ندییه کانی سه رمایه ی بیانی ، که دواتر بتوانن ده وری کاریگه ریان هه بێت له بریاری سیاسی عوسمانیه کان .

مه به ستی ئه وروپیه کان به گشتی ، به تایبه تی به ریتانیا ، له هه لوه شاندنه وه ی قه واره ی ئیمپراتوریه تی عوسمانی ، خۆی له کۆنترۆل کردنی رێگای هاتوچۆی ده ریایی (ده ریای سپی ، که نالی سویس ، ده ریای سوور ، ئۆقیانووسی هیندی) ده دۆزێته وه ، واته دابین کردنی رێگای نێوان هیندو ئه وروپا . له و کاته شدا که ناره کانی ئه و رێگایه به ته واوه تی له ژێر کۆنترۆلی ده سه لات و نفوزی عوسمانیه کاندا بوو . قه واره ی ئه مرۆی تورکیاش ،که نارێکی به هێزی ئه و رێگایه یه ، که ده توانێ ده وری کاریگه ر ببینێ له دابین کردنی ئاسایش بۆ ئه و رێگایه .

جگه له وه ، له پال ئه و رێگایه ده ریاییه ، رێگای وشکایی بۆ گه یشتن به هیندو ئه و ناوچانه ، ده روازه که ی له پایته ختی ولاتی عوسمانیه کان ده ست پێ ده کات و به زۆربه ی ئه و ناوچانه تێ ده په رێ که که وتونه ته ژێر رکێفی ده سه لاتی عوسمانیه کان ، سه ره رای ئه وه ش ، هه ردوو گه رووی بسفۆرو ده رده نیل ی تورکه کان ، ده روازه یه کی گرنگه بۆ به ستنه وه ی ولاتانی ده ریای ره ش به ده ریای سپی . هه روه ها تاکه رێگای ده ریایی رووسه کانه ، که هه ره شه له به رژه وه ندییه کانی به ریتانیا و فه ره نسا بکات له ناوچه که . جا بۆ سه پاندنی ئه و رایه ، به ریتانیا و فه ره نسا دواتر ئیتالیه کان هه ر زوو که وتنه خۆ بۆ کۆنترۆل کردنی که ناره کانی ئه و رێگایه . فه ره نسیه کان به شێك له که ناره کانی باکووری ئه فریقایان کۆنترۆل کرد ، دواتریش ئیتالیه کان لیبیایان داگیر کرد ، ئینگلیزه کانیش میسرو سودانیان داگیر کرد . واته ته واوی که ناره کانی رۆژئاوای ئه و رێگایه ده ستی به سه ردا گیرا . مایه وه که ناره کانی رۆژهه لاتی هه ورێگایه . بۆیه جێگای سه رسوورمان نێ یه ئینگلیزه کان له سالی ( ١٩١٦ ) پشتیوانی له راپه رینی چه کدارانه ی خێله کانی دوورگه ی عه ره ب بکه ن دژی ده سه لاتی عوسمانیه کان . به پێ ی به رنامه یه کی دارێژراوی ئینگلیزه کان ، هێزه راپه ریوه که ی دوورگه ی

عەرەب کەنارەو کەناری رۆژهەلاتی دەریای سوور هەلبکێشن و بەرەو ولاتی سوریاو لە هێزەکانی عوسمانی پاکی بکەنەوە. لەو لاشەوە پێشتر لوبنان لە ژێر دەسەلاتی فەرەنسیەکان بوو، هەروەها فەلەستین کەوتبووە ژێر کونترۆلی ئینگلیزەکان. لە نێو دەریای سپی ناوەراستیشدا جگە لە تورکیای ئیستا، دوورگەکانی یۆنان و قوبرس لە سالی ۱۸۷۱ەوە کەوتبوونە ژێر دەسەلاتی عەسکەری ئینگلیزەکان. واتە لێرە بۆمان دەردەکەوێت، کە هەموو هەول و تەقەلای ئینگلیزەکان. خۆی لەوەدا دەدۆزیەوە، کە بتوانن بە تەواوەتی ئەو رێگا دەریاییە مسۆگەر بکات. دوای ئەوەی سامانی (نەوتیش) لە ناوچەکە دۆزرایەوە. گرنگی ستراتیجی ئەو رێگایە بۆ ئینگلیزەکان و دواتر بۆ ئەمریکی یەکان زیاتر بوو. جا لە پەراوێزی ئەو راستیانەدا، بەریتانیا چاک درکی بە گرنگی شوێنە ستراتیجیەکەی تورکیا کردبوو، بە تایبەتی پاش ئەوەی کۆمۆنیستەکان لە سالی (۱۹۱۷) دەسەلاتی سیاسیان بەسەر (۱/۳) گۆی زەوی داگرت، ئەمەش بە هەرەشەیەکی تر دەژمێردرا بۆ سەر ولاتانی سەرمایەداری ئەوروپا، هەروەها پاش ئەوەی کۆمۆنیستەکانی مۆسکۆ دەورێکی بالایان لە یارمەتیدانی تورکەکان بینی، لە دژی هێزە هاوپەیمانەکان، ئەمەش ترسێکی گەورەی لە لای ئینگلیزەکان دروست کرد، کە تورکیا خۆی بداتە پال مۆسکو. هەروەها شکستی یونانەکان بەرامبەر بە تورکەکان. وای لە بەریتانیا کرد سیاسەتێکی نەرمکارانە بەرامبەر بە تورکەکان بنوێنێ. دوای ئەو شکستەی یونانەکان هەولە دبلۆماسیەکانی بەریتانیا لە نێوان سالانی (۱۹۲۲ ـ ۱۹۲۳) تەنیا لە دوو ئامانجی سەرەکیدا خۆی دە ردەخست، ئەویش (۶/۶۷).

۱ ـ هەلوەشاندنەوەی (خەلافەتی) عوسمانی، چونکە مانەوەی (خەلافەت) بە فاکتەرێکی ترسناک دەژمێردرا لەسەر (مستعمراتەکان)ی ئینگلیز، بە تایبەتی زۆربەی ئەم (مستعمراتانە) موسلمان بوون. مانەوەی (خەلافەت) دەبێتە مایەی هەرەشەیەکی تر لە دەسەلاتی ئینگلیزەکان لەو ناوچانەدا، هەروەها دەبێتە خالێکی گرنگ بۆ کۆکردنەوەی ئیسلامەکان. ئەم راستیەش لە کاتێکدا دەردەکەوێ، کاتێ ئەتاتورك سەرگەرمی هەلوەشاندنەوەی (خلافەت) بوو، دوو کەس لە هیندستان بە ناوی نوێنەرانی ئیسلامی یەکانی هیند (ئەمیر عەلی و ئاغا خان) لە (۲٤ تشرینی یەکەمی ۱۹۲۳) نامەیەك ئاراستەی عصمت ئینینۆ دەکەن، تیایدا داوا دەکەن، (خەلافەت) وەك نیزامێکی سیاسی لە تورکیا بمێنێتەوە.

۲ ـ دوورخستنەوەی هاوپەیمانان (فەرەنسا و ئیتالیا و یۆنان) لە تورکیا.

ئەم دوو ئامانجەی بەریتانیا بە تەواوەتی لە پەیمانی لۆزان (۲٤ تەمموز ۱۹۲۳) رەنگی داوەتەوە. بە تایبەتی ئامانجی یەکەم. بەریتانیا لە (لۆزان)

بەرامبەر بە دانپیانانی بەسەربەخۆیی تورکەکان ، چوار مەرجی سەرەکی خستە بەردەم تورکیا . کە ئەمانە بوون (هەلوەشاندنەوەی خەلافەتی عوسمانی ، دەرکردنی خەلیفە بۆ دەرەوەی سنووری تورکیا ، دەست بەسەرداگرتنی پارەو پولی خەلیفە ، راگەیاندنی بەعلمانی کردنی دەولەت ) (٧١/٦).

بە تەنیا جێ بەجێ کردنی ئەم چوار مەرجە؛ تورکەکان دەسەلاتی تەواویان بەسەر تورکیادا دەبێت ، بەناوچەکانی تراقیا و کلکیلیاشەوە . کە تا ئەو کاتە لە ژێر دەسەلاتی ئینگلیزەکان دا بوو ، هەروەها رەت کردنەوە و نەهێشتنی گشت ئیمتیازاتەکانی ولاتانی ئەوروپا لە تورکیا ، واتە دوورخستنەوەی نفوزی ئەوروپیەکان لە تورکیا . ئەوەبوو تورکەکان لە (١٩٢٤/٣/٣) خەلافەتیان بە بریارێکی کۆنگرەی نیشتمانی گەورەی تورك هەلوەشاندەوە . ئەم هەلوێستەی تورکەکان و ئەم نەرمییەی ئینگلیزەکان سەرەتایەك بوو ، بۆ لێك نزیك بوونەوەو لێك گەیشتن و هاریکاری نێوان هەردوولا ، سەبارەت بە کێشە هەلواسراوەکانی نێوانیان وەك چارەسەری کێشەی موسل ، دیارکردنی (هێلی بروکسل) بەرامبەر بە (١٠٪)ی نەوتی موسل ، خۆی لە خۆیدا ئەو راستیەی سەرەوە دەسەلمێنێ . بەلکو هەندێك لە نووسەرانی سیاسی ، ئەم لێك نزیك بوونەوەی ئینگلیزەکان و خۆدی ئەتاتورك ، بۆ سەردەمی عوسمانیەکان دەگێرنەوە ، کاتێ ئەتاتۆرك بۆ خوێندنی عەسکەری بالا بۆ ماوەی دوو سال رووی لە شاری مانشستر کرد ، و دۆستایەتی بۆ خۆی لەگەل ئینگلیزەکان دا بنیات نا . دوای رووداوی سامسون گشت هەول و تەقەلاکانی ئینگلیز خۆی لە جێ پێ قایمکردن و کۆکردنەوەی خەلك لە دەوری ئەتاتورك ، کە ئەو وەختە لە ئەنادول بوو ، دەبینیەوە .

کاتێ ئینگلیزەکان لە (١٩ مایسی ١٩١٩) ویستیان شاری سامسۆنی نزیك کەنارەکانی دەریای رەش داگیر بکەن . پێش وەخت سوپای تورکی بە سەرکردایەتی ئەتاتۆرك دەگاتە ناوچەکە ، ئینگلیزەکانیش شارەکە داگیر ناکەن و پاشەکشە دەکەن . لێرەدا دەپرسن ، ئایا ئینگلیزەکان ئەگەر مەبەستیان داگیرکردنی ئەو شارە بوایە ، بۆچی داگیریان نەکرد ؟ ئایا ئینگلیزەکان نەیاندەتوانی دژی ئەو (١٠٠) سەربازە تورکەی . کە بە فەرماندەیی (رەفعەت بێگ) هاتبوون بۆ بەربەرچدانەوەی هێرشی ئینگلیزەکان ، شەر بکەن ؟! ئایا مستەفا کەمال هەوال و زانیاری ئەو هێرشەی ئینگلیزەکانی لە کوێ زانی ؟! (٦٦/٦).
هەروەها نووسەران رووداوێکی تر دەگێرنەوە دەلێن :ـ لە رۆژانی (٢٣ ئاب تا ١٣ ئەیلولی ١٩٢١) شەری (ستاریا )ی نێوان تورك و یونانەکان ، کە ئەو کاتە گشت سوپاکەی ئەتاتورك سەرقالی ئەو شەرە بوون ، ئایا ئینگلیزەکان نەیاندەتوانی (١ ـ٢) لیوای سەربازی بەرەو ئەنادۆل بەرێبخات و لە پشتەوە بەرەیەکی تری شەر

له دژی تورکه کان بکاته وه و کۆتایی به ده سه لاتی ئه تاتورك بهێنابایه ؟! ئه گه ر ئینگلیزه کان مه به ستی لێدانی ئه تاتورکیان هه بوایه ؟! (٦٦/٦). هه روه ها رێگاگرتن له کتێبی (ژیانم و بیره وه ریه کانی) (رضا نوری) گه وره ئه فسه ری شه ری رزگاری تورکیا و وه زیری ته ندروستی سه رده می ئه تاتورك ، له تورکیا ، که باس له کاره دزێوه کانی ئه تاتۆرك ده کا ، ئێستا ده ست نووسه که ی له مۆزه خانه ی به ریتانی پارێزراوه ، ده بێ چی بگه یه نێ (٦٩/٦) ؟! بۆ وه لامی ئه م پرسیارو گومانانه ، ده بێت چاوێك به و به لگه نامانه ی نێو دۆسێ ی وه زاره تی ده ره وه ی به ریتانیا بخشێنینه وه ، تاراستی و ناراستی ئه و مه سه له یه مان بۆ ده رکه وێت ! !
جگه له وه مۆرکردنی په یمانی سعد ئاباد له سالی (١٩٣٧) له سه رده می ئه تاتورك ، له گه ل ئێران و عیراق و پاکستان بۆ گه مارۆدانی سۆڤیه ت و به رهه لستی کردن و لێدانی هه ر جولانه وه یه کی رزگاریخوازانه ی نه ته وه ژێر ده سته کانی نێو ئه و ولاتانه . به تایبه تی جولانه وه ی رزگاریخوازی گه لی کورد ، ئه لقه یه کی تری هاریکاری ژێر په رده یی نێوان تورکیا و ئینگلیزه کان ده خاته روو . هه روه ها له سه ره تای جه نگی جیهانی دووه م تورکه کان له (٢٣ تشرینی ١٩٣٩) رێکه وتنێکی هاوپه یمانانه یان له گه ل ئینگلیز و فه ره نسیه کان مۆرکرد ، به مه به ستی دابین کردنی یارمه تیه ئابووری و عه سکه رییه کانی ئه و دوو لایه (٦٤/٤) . له کاتێکدا په یمانی دۆستایه تی و هاریکاریان له سالی (١٩٣٥) بۆ ماوه ی (١٠) سالی تر له گه ل سۆڤیه ت نوێ کرده وه . پاش ئه وه ی (١٠) سال به سه ر هه مان جۆره په یمان تێ په ریبوو . هه ر بویه ستالین یه کلایه نه له ئه نجامی په یمانی (١٩٣٩) پێش کۆتایی هاتنی جه نگی جیهانی دووه م به ماوه یه کی که م بریاری هه لوه شاندنه وه ی په یمانی دۆستایه تی و هاریکاری سالی (١٩٢٥) ی راگه یاند (٢٥/٢) .

جگه له وه له کۆتایی جه نگی جیهانی دووه م ئینگلیزه کان به هۆی خراپی باری ئابووریان ، تورکه کانیان به پێ ی رێکه وتنی (١٩٣٩) به ئه مریکا سپاردو وایان کرد ناوی تورکیا بخه نه نێو لیستی یارمه تی یه ئابووری و عه سکه ری یه کانی هه ردوو پرۆژه ی (مارشال و ترۆمان)ی ئه مریکی یه کان . پاشانیش هه ر به پشتگیری ته واوی ئینگلیزو ئه مریکی یه کان ، تورکیا ئه ندامیه تی په یمانی ناتۆ و ئه نجومه نی ئه وروپی پێ به خشرا . جگه له وه دلسۆزی تورکه کان بۆ ئینگلیزه کان له سازدانی ئه و (حلف)ه سه ربازیانه ی رۆژهه لاتی ناوه راست و به لقان ده رده که وێ ، که به راسپارده ی ئینگلیزو ئه مریکی یه کان چه ند ئه لقه یه کی تری (په یمانی ناتۆ) ی وه ك (سانتۆ به لقان) له و ناوچانه سازدا . جا له په راوێزی ئه و راستیانه دا ده توانین بلێین ، نفوزی ئینگلیزه کان له تورکیا ده ورێکی بالای هه بوو ، له زیاتر

بە رۆژئاوایی کردنی تورکەکان و پەلراکێشانی بۆ نێو حلفە رۆژئاواییەکان بەمەبەستی زیاتر خزمەتکردنی بەرژەوەندییەکانی بەریتانیاو ئەمریکا لەناوچەکە لەلایەك و پاراستنی رێگا دەریای یەسەرەکیەکەی بەریتانیا و ئەمریکا مەبەستیان بوو، لەلایەکی ترەوە. هەروەها شوێنە ستراتیجی و گرنگەکەی تورکیا لە خزمەتکردنی جەنگی ساردی نێوان رۆژهەلات و رۆژئاوادا بۆیە هەنگاوەکانی بەرۆژئاوایی کردنی تورکەکان لەسەر دەستی ئەتاتورك و میراتگرانی. لە چەکەرەکردن و زیادبوونی نفوزی سیاسی ئەوروپیەکان لە تورکیاوە سەرچاوە دەگرێ، بە (علمانی) کردنی تورکیا، خواست و ویستی زۆریەی هەرەزۆری تورکەکان نەبوو، بەلکو خواست و ئاواتی ئینگلیزەکان بوو. ئەتاتورکیش بە دیهێنەری ئەو خواست و ئاواتە بوو. بۆ سەلماندنی ئەو راستیەش لە سەردەمی ئەتاتورکدا، کاتێك بریاری رەتکردنەوەی (خلافە)ی عوسمانی و بە(علمانی) کردنی ولاتی تورکیا درا. بە ئاشکرا ئەندامانی پەرلەمانی تورکی، کە دۆست و هاورێ و هاوخەباتی ئەتاتورك بوون، دژی ئەو بریارانە وەستان، تاکار گەیشتە ئەو رادەیەی هەولی تیرۆرکردنی ئەتاتورك بدەن. چونکە دژی خواست و ئیرادەی زۆرینەی گەلەکەی بوو. هەردوو ئاقمەکەی (علی شکری و رەئووف بێگ)ی نێو پەرلەمانی تورکی شایەدی ئەو راستیەن«٢».

## سەرەتاکانی هەژموونی ژەنەراڵەکان لە کوێ‌وە بوو؟

لە کۆتایی سەدەی شانزەهەم، رەوشی عەسکەری دەوڵەتی عوسمانی گۆرانکاریەکی گەورەو گرنگی بەخۆوە بینی. ئەویش وەرچەرخانی ستراتیجی عەسکەری بوو، لە حاڵەتی هێرشکردن بۆ حاڵەتی بەرگری. ئەم حاڵەتەش لە ئەنجامی چەند هۆکارێکی بابەتی و خۆیی سەری هەلدا.

١ـ خراپ بوونی باری ئابووری دەوڵەت، لە ئەنجامی گەشەسەندنی بزوتنەوەی دۆزینەوە جوگرافیەکان لە کۆتایی سەدەی پانزەهەم. ئەویش دۆزینەوەی چەند بازارو رێگایەکی تری وەك ئەفریقیاو ئەمریکا بوو. کە بووە مایەی کزبوونی هاموشۆی بازرگانی ترانزێت لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا.

٢ ـ رووخانی ئیمپراتوریەتی رۆمانی پیرۆز لە سەدەی شانزەهەمدا، بووە مایەی گەشەسەندنی هەستی نەتەوایەتی ئەوروپیەکان. سەرهەڵدانی ئەم هەستەش زەمینەی بۆ هاتنەکایەی قەوارەی نەتەوەیی خۆش کرد. جا بۆ دروست بوون و پاراستنی ئەو قەوارانەش پێکهێنان و رێکخستنی سوپای سەربازی خاوەن دیسپلین و بەتوانا و نوێ وەك زەرورەتێك، لەدایك بوو، ئەمەش لەلایەك بووە

مایه ی ئه وه ی، که سوپای کۆنی ده ره به گی عوسمانی نه توانیٚ خۆی له به رده م ئه و سوپایانه رابگریٚت، له لایه کی تر ئه م سوپایانه ببنه به ربه ستێك له به رده م په لهاویٚشتنی سوپای عوسمانی بۆ ده ره وه ی سنووره کانی خۆی.

۳ ــ مردنی سولْتانه به هێزو عه سکه ری یه کانی ده وڵه تی تولیتاری عوسمانی، چونکه تا ئه و کاته سولْتانه کان خۆیان سه ر له شکری هێزه سوپای یه که ی ده وڵه تیان ده کرد.

٤ ــ ده سه لاٚت وه رگرتنی سولْتانه بیٚ هێزه کان، که زۆربه یان ویٚلی تێرکردنی ئاره زووه تایبه تیه کانی خۆیان بوون. له و کاته وه ش پله و پایه ی سولْتان، پله و پایه ی عه سکه ری له به رخۆ داماڵی. کارو پیشه ی سولْتانیش ته نیا ده رکردنی فه رمان بوو له کونجی کۆشکه وه.

به حوکمی ئه وه ی سیسته می به ریٚوه بردنی ولاٚتیش له دامووده زگای سوپاوه سه رچاوه ی ده گرت، له ئه نجامدا سوپا وه ك تاکه هێزی ده سه لاٚت، به بیٚ سه رکرده یه کی عه سکه ری و ئیداری به توانا، خۆی له به رامبه ر کۆمه لێك کێشه ی ده ره کی و ناوه کیدا دۆزییه وه. له کاتێکدا پێشتر سولْتان خۆی له ناو سوپا و له گه لْ سوپادا چاره سه ری ئه و کێشانه ی ده کرد.

هه روه ها پیاوانی ئایینیش، به مه به ستی فراوانکردنی ده سه لاٚتیان، ده وری بالاٚیان ده بینی له خۆشکردنی زه مینه ی ناکۆکیه کانی نێوان سوپاو سولْتانه کان. زۆر جار سوپا به فیتی پیاوانی ئایینی سه باره ت به چۆنیه تی چاره سه رکردنی کێشه کان، له گه لْ سولْتانه کان ده که وته کێشه. ئه مه ش بووه هۆی ئه وه ی که سوپا به رده وام به رووی سولْتانه بیٚ هێزه کان دابته قێته وه. زۆر جاریش ده سه لاٚتی سیاسی له ده ست سولْتانه کان ده رده هێنا. جا له و کاته وه پیشه ی سوپا بووه هێنانه خواره وه ی ئه م جۆره سولْتانه بیٚهێزانه له سه ر کورسی حوکم. بۆیه سه یر نی یه له کۆتایی سه ده ی شانزه هه م تارووخانی ده وڵه تی عوسمانی، له کۆی (۲۷) سولْتان ته نیا یه ك دوو سولْتان نه بیٚ (سولتان مورادی چواره م «۱٦۲۳ــ ۱٦٤۰» که حوکمی عیراقی بۆ جارێکی تر له ده ست سه فه وییه کان ده رهێنا، هه روه ها سولتان مه حمودی دووه م «۱۸۰۸ــ۱۸۳۹» کاتیٚ توانی سوپای کۆنی ئینکشاریه هه لبوه شێنێته وه و سوپای نویٚ دابمه زریٚنیٚ) (۱۸۳/۱) نه وه ك سه رجه م سولْتانه کانی تر له ئه نجامی کوده تای سه ربازی ده سه لاٚتیان لێسه ندراوه ته وه. ئه مه ش ده مانگه یه نێته دوو ئه نجام:ــ

۱ــ بیٚ هێزبوون و له به ر یه ك هه لوه شانه وه ی ده وڵه تی عوسمانی، هۆیه که ی ده ست تێوه ردانی سوپا بوو له کاروباری ولاٚت و زالبوونی ده سه لاٚتی میلیتاریانه ی خۆی به سه ر شێوازی به ریٚوه بردنی حوکمدا. ئه مه ش بووه مایه ی سه ر ئێشه و

تلانه وه ی عوسمانیه کان له و کاته وه به ده ست کێشه ناوخۆییه کان.
٢ ـ نه بوونی هێزی سێ یه م، له نێوان سوپا و سوڵتانه کان. ته نیا سوپا وه ك تاکه هێزی به ره ی ئۆپۆزسیۆن له دژی سوڵتانه کان کاری ده کرد.
به هه مان شێوه ش ئه م دوو حاڵه ته ی سه ره وه له ئێستای ژیانی سیاسی و کۆمه ڵایه تی ده وڵه تی نوێ ی تورکیا به رجه سته بووه. به ڵکو هه ندێك له گروپه سیاسیه کانی تورکیا تا ساڵانی (١٩٦٠) به رده وام چاویان له ده ستی سوپا بووه بۆ هێنانه دی گورانکاری ی سیاسی له وڵاتدا، سوپاشیان به دامووده زگایه کی شۆرشگێر له قه ڵه م داوه، هه روه ك دکتۆر حکمت قفلجه میل ده ڵێت (سوپای تورکی په یوه ندیه کی به تینی به گه لی تورکه وه هه یه. وه به رده وام هاوسۆزی میلله ت بووه. هه ر کاتێك کۆنه په رستانی وڵات ویستبیان خۆیان ته سلیمی نفوزی بێگانه بکه ن. هه رزوو سوپا سه نگه ری خۆی بۆ به ره ی شۆرشی جه ماوه رو میلله ت گواستۆته وه، بۆ دژایه تی کردنی ئه و تاقمه، چونکه سوپا تاکه هێزی به بیروباوه رو رێك وپێکی جه ماوه ری گه له) «١٧ـ١٢» هه روه ها کێشه ناوخۆیی یه کانی ئه مرۆی تورکیاش به هه مان شێوه له ئه نجامی ده ست تێوه ردانی سوپا له ژیانی سیاسی تورکه کان، بۆته مایه ی هه ره شه کردن له قه واره ی ئێستای تورکیا.
دوای ئه وه ی تورکیای نوێش له سه ر ده ستی مارشال ئه تاتورك و سوپاکه ی دامه زرا. حوکمی میلیتاری سوپا به ته واوه تی له چوارچێوه ی بنه ماکانی ئه تاتورك (علمانیه ت، قه ومیه ت، ده ولیه ت، مللة تیه ت، جه مهوریه ت، ئینقلابیه ت) چه سپا. ئه تاتورکیش به دارشتنی ئه و بنه مایانه باری ئابووری و سیاسی و کۆمه ڵایه تی و رۆشنبیری وڵاتی ته واو له قالب داو کۆنترۆل کرد. لادانیش له هه ر یه ك له و بنه مایانه، مانای شلۆق کردنی حوکمی میلیتاری ده گه یاند. بۆیه سوپا به هه موو شێوه یه ك به گژ ئه و گروپ و که سانه دا ده چۆوه، گه ر نیازی شلوق کردن و ره تکردنه وه ی یه کێك له و بنه مایانه ی هه بوایه. له ناوبردنی هه ردوو باڵی (عه لی شکری و ره ئووف بێگ) له نێوان ساڵانی (١٩٢٢ ـ ١٩٢٤ له نێو په رله مانی تورکی، که دژی ره تکردنه وه ی (خه لافه) و گۆرینی هه ڵس وکه وتی کۆمه ڵگای تورك بۆ سه ر شێوازی ئه وروپیانه و به علمانی کردنی ده وڵه ت بوون. هه روه ها دامرکاندنه وه و له ناوبردنی هه ردوو راپه رینی (١٩٢٥ـ١٩٣٠) کورده کان به زه بری ئاگرو ئاسن و له سێداره دانی رابه رانی ئه و دوو راپه رینه و ده ست پێ کردنی شالاوی راگواستنی کورده کان و راگه یاندنی (باری نائاسایی) هه ر له ساڵی (١٩٣٦) ه وه به سه ر (١٢) ویلایه تی کوردنشیندا، ئه گه ریش به ڵگه ی زیندوو نه بووبن بۆ به میلیتارکردنی ژیانی ئاسایی ده وله تی تورکیا، ئه وا زه مینه

خۆشکردن بوون بۆ ئه‌و ئامانج و مه‌به‌سته. که‌ تا ئێستاش مانه‌وه‌ی (باری نائاسایی) به‌سه‌ر ناوچه‌ کوردنشینه‌کان له‌ لایه‌ن سوپاوه. به‌وه‌فایه‌ك ده‌ژمێردرێت بۆ ئه‌تاتورك، بۆیه‌ سه‌یر نی یه‌ دوای مردن ئه‌تاتورك له‌ (۱۰ی تشرینی یه‌که‌می ۱۹۳۸) هیچ گۆرانکارییێکی سیاسی ئه‌وتۆ له‌ تورکیا روونه‌ دات و ده‌سه‌لاتی میلیتاری شلۆق بێت. به‌ڵکو دیسانه‌وه‌ بۆ په‌ره‌ پێدان به‌و شێوازه‌ حوکمه‌، جه‌نه‌راڵێکی تری سوپای وه‌ك (عصمت ئینینۆ)ی پاڵه‌وانی شه‌ری ئینینۆی دژ به‌ یۆنانه‌کان بکرێته‌وه‌ به‌ سه‌رۆك کۆمار. هه‌ر چه‌نده‌ له‌ دوای ساڵی (۱۹٤٥) به‌حوکمی خۆگرێدانی تورکه‌کان به‌ ئه‌وروپاوه‌. سیسته‌می تاك حزبی گۆرانکاری به‌خۆیه‌وه‌ بینی و سیسته‌می فره‌حزبی راگه‌یاندرا. به‌لام ئه‌م جه‌نه‌راله‌ تا ساڵی (۱۹٥۰)و دواتریش ناوه‌ ناوه‌ بۆ دووباره‌ سه‌پاندنه‌وه‌ی حوکمی میلیتاریانه‌ی به‌سه‌ر ولاتدا ده‌هێنرایه‌وه‌ سه‌ر کورسی حوکم.

به‌لام دوای ئه‌وه‌ی حزبی گه‌لی کۆماری، حزبه‌که‌ی ئه‌تاتورك و زۆرینه‌ی جه‌نراله‌ عه‌سکه‌رییه‌کان، له‌ ئه‌نجامی هه‌لبژاردنه‌کانی (۱۹٥۰) شکستی به‌رامبه‌ر خه‌لکانێکی تر هێنا، که‌ سه‌ر به‌ دامه‌زگای میلیتاری ده‌وله‌ت نه‌بوون. که‌وته‌ به‌ره‌ی ئۆپۆزسیون، له‌و کاته‌وه‌ ئارامی له‌ سوپا و حزبه‌که‌ی ئه‌تاتورك هه‌لگیراو، که‌وته‌ به‌ربه‌ره‌کانی کردنی ئه‌و تاقمه‌ سیاسی یه‌ نوێ یه‌ی، که‌ به‌ ئه‌ندامانی حزبی دیموکراتی نوێنه‌ری سه‌رمایه‌داره‌ په‌نگ خواردوه‌کانی (۲۷) ساڵ حوکمی ژێر ده‌ستی عه‌سکه‌ره‌کان ده‌ناسران، بۆیه‌ ده‌توانین بلێین ساڵی (۱۹٥۰)، ساڵی هه‌ره‌س هێنان و دارمانی یه‌که‌ یه‌که‌ی بنه‌ماکانی ئه‌تاتورك بوو. وه‌ سه‌ره‌تای ژیانێکی سیاسی نوێ بوو بۆ تورکه‌کان. چونکه‌ له‌و ساله‌ به‌ دواوه‌، دووباره‌ رووبه‌رووبونه‌وه‌ی عه‌سکه‌رو سیاسییه‌کان سه‌ری هه‌لدایه‌وه‌، که‌ هه‌ریه‌که‌یان له‌ به‌ره‌یه‌کی جیاوازدا کاریان ده‌کرد. سیاسی یه‌کان هه‌ولیان ده‌دا له‌ رێگای دارمانی بنه‌ماکانی ئه‌تاتورك له‌ مه‌ودوا سوپا بکه‌نه‌ پاشکۆی خۆیان. که‌ چی عه‌سکه‌رییه‌کانیش به‌ هه‌مان شێوه‌ سه‌رگه‌رمی پاراستنی ئه‌و بنه‌مایانه‌ بوون و به‌ پێچه‌وانه‌ی بیدو بۆچوونی سیاسی یه‌کان کاریان ده‌کردو رۆژ له‌دوای رۆژ ریزه‌کانی خۆیان و جۆری چه‌ك و ده‌سه‌لاتی خۆیان له‌ رێگای (په‌یمانی ناتۆ) پته‌وتر ده‌کرد. هه‌روه‌ها ئه‌مریکاش، له‌و راستیه‌ گه‌یشتبوو، که‌ تاکه‌ هێز له‌ تورکیا، ده‌سه‌لاتی راسته‌قینه‌ی هه‌بێت سوپای تورکی یه‌، بۆیه‌ زیادکرنی ده‌سه‌لاتی سیاسیانه‌ی ئه‌مریکیه‌کان له‌ نێو سوپادا به‌کارێکی ئاسایی داده‌نرێ ئه‌مه‌ له‌ لایه‌ك له‌ لایه‌کی تره‌وه‌ به‌رژه‌وه‌ندی یه‌کانی سوپاو ئه‌مریکا له‌ دوو خاڵی گرنگ یه‌کتر ده‌گرنه‌وه‌. که‌ ئه‌ویش پاراستنی قه‌واره‌ی سیاسی و جوگرافی ئێستای تورکیا یه‌و هه‌روه‌ها پاراستنی سیسته‌می سیاسی ناوه‌وه‌ی ولاته‌. له‌ دژی ئه‌و

تاقم و گروپانە ی دژایە تی بە رژە وە ندی یە ناوچە یی یە کانی ئە مریکا دە کە ن.
بۆیە ئە مریکا چ لە رێگای پە یمانە دوو قولیە کانی لە گە ل تورکیا چ لە رێگای پە یمانی ناتۆ، بە ردە وام هە وڵی داوە رە وتی میلیتاری تورکە کان بە هێز بکات.
ئە و راستیە ش لە کودە تاکانی (١٩٦٠، ١٩٧، ١٩٨٠) تێبینی دە کرێت.
دوای هە ر کودە تایە کیش سوپا بۆ سیاسیە کانی دوورپات دە کردە وە، کە مە حالە دە سە لات لە سوپا بسە نرێتە وە، ئە گە ر بێتوو سیاسی یە کان کار بۆ بنە ماکانی ئە تاتورک نە کە ن و دژی ئامانج و خواستە کانی ئە مریکاش بن.. ئە وا بە زە بری لولە ی تفە نگ و زریپۆش دە سە لاتیان لێ دە سە ندرێتە وە. بۆیە گشت هۆکارە کانی سە رهە لدانی ئە و کودە تایانە، خۆی لە سە ر پێچی کردنی ئە و دو ئامانجە ی سە رە وە، لە لایە ن سیاسی یە کانە وە دە دوزیە وە جا بۆ ئە وە ی زیاتر لە مە بە ستی کودە تاچی یە کان بگە ین، پێویستە هۆکارە کانی ئە و کودە تایانە بە کورتی بخە ینە بە ر چاو.

## هۆکارە کانی کودەتای (١٢ی مایسی ١٩٦٠)

١ ـ حزبی دیموکرات لە ماوە ی (١٠) سالی دە سە لاتی خۆی (١٩٥٠ـ١٩٦٠) بۆ زیاتر سە قامگیرکردنی پایگای حزبی خۆی لە ناو تورکە کان، هە ستی کیکراوی خە لکی موسلمانی تورکیای قۆزتە وە و ئازادی بیرورای ئاینینی کردە کارێکی ئاسایی رۆژانە ی تورکە کان. کە لە ماوە ی (٢٧) سال حوکمی حزبی گە لی کۆماری تووشی داپلۆسین هاتبوو. ئە مە ش لە لایە ن سوپاوە بە هە رە شە یە کی جدی دە ژمێردرا بۆ سە ر بنە مای (علمانیە ت).
٢ ـ بۆ چاککردنی باری ئابووری داتە پیوی تورکیا، دە سە لاتدارانی حزبی دیموکرات. ویستیان روو لە مۆسکۆ بکە ن. ئە مە ش لە و کاتە دا کارێکی زۆر ناپە سە ند بوو، کە ئە ندامانێکی ناتوو روو لە دوژمنێکی سە رە کی ئە و پە یمانە بکە ن. کە بە هە رە شە یە کی جدی دادە نرا بۆ سە ر شلۆق بوونی لای خواروی ئە و پە یمانە و ئامانجە ستراتیجیە کانی ئە مریکا لە ناوچە کە دا، بۆیە لە (١٢ی مایسی ١٩٦٠) بە فە رماندە یی ژە نە رال جە مال گورسیل یە کە م کودە تا لە سە ردە می تورکیای نوێدا بە رپا کرا.

## هوکارە کانی کودەتای (٢٧ی ئاداری ١٩٧١)

١ـ لە سالانی (٦٠ـ ٧٠) بزووتنە وە ی چە پ، لە دونیا بە گشتی و لە ناوچە کانی رۆژهە لات بە تایبە تی بە شیوە یە کی ترسناك و کاریگە ر گە شە ی سە ند.
تورکیاش لە و بزووتنە وە یە بە دە ر نە بوو چە ندین حزب و گروپی سیاسی چە پ لە تورکیا دە رکە وتن و بزووتنە وە ی کریکاری و خویندکاری گە شە ی سە ند ئە مە ش ترسی دە ست تیوە ردانی دە رە وە ی لە نیو کاروباری ناوخوی ولات زیاتر

کرد .

٢ ــ فراندنی (٤) سەربازی ئەمریکی لە شاری نیفیە لەلایەن (٤) خوێندکاری سەربە گروپیکی چەپ . بەمەبەستی دژایەتی کردنی بوونی سەربازی ئەمریکی لەتورکیا (٢٠٩/٢) ئەمەش زەنگی خەتەر بوو بۆ ئەمریکیەکان . کە مانەوەی سەربازی خۆیان لەتورکیا مسۆگەر بکەن . ئەمەش دەبووە هۆی شلۆق کردنی بەرەکانی جەنگی سارد ، بەو پێ یەش خواست و ئامانجەکانی ئەمریکای لەناوچەکە تووشی مەترسی دەکرد .

بۆیە لە (١٢ ئازاری ١٩٧١) چوار ژەنەرالی سوپا ئیتزاری وازهێنانی دەسەلاتیان ئاراستەی جودت صوونای سەروک کۆمارو سلیمان دیمریل سەرۆك وەزیران کرد ، ئەوە بوو هەردوولا دەستیان لەکار کێشاوە .

## هۆکارەکانی کودەتای (١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠)

١ــ گەشەسەندن و سەرهەلدانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد لەتورکیا و عیراق .

٢ــ بەهێزبوونی بزووتنەوەی چەپ و کرێکاری لەتورکیا . هەروەها گەشەسەندنی حزب و تاقمی خاوەن بیروباوەری ناسیونالستی تورکی و ئوسولی . لەئەنجامی گەشەسەندی ئەم تاقم و حزبانە ، جۆریك لەتوندو تیژی بالی بەسەر ولاتدا کێشا ، کە تا ئەو کاتە تورکیا بەخۆیەوەی نەبینیبوو .

٣ــ خراپ بوونی باری ئابووری تورکیا بەشێوەیەکی بەرچاو ، بلاوبونەوەی گەندەلی و بەرتیل خواردن لەگشت دام و دەزگاکانی دەولەت بەهەر سێ دەسەلاتیەوە . هەروەها لەسەرەتای سالی ١٩٨٠ هەلاوسان بەرێژەی (١٠٠٪) بەرزبووەو قەرزەکانی تورکیاش لەکۆتایی سالی (١٩٧٩) خۆی لە (١٤,٦) ملیار دۆلار دەدا . لەئەنجامی ئەم قەیرانە ئابووریە تاقمێکی موشەخۆر کە خۆی لە (٢,٥٪)ی سەرجەم دانیشتوانی تورکیا دەدوزیەوە ، توانی دەست بەسەر (٣١٪)ی داهاتی گشتی دابگرێت ، لەبەرامبەر ئەوەشدا توێژی ئاسایی کۆمەلگای تورکی کە (٣٠٪) دانیشتوانی تورکیایان پێك دەهێنا . (٧٪)ی لەداهاتی گشتی بەردەکەوت . ئەم بارودۆخەش کۆچکردنێکی فراوانی لەلادی ــ وە بۆ شار لەگەل خۆ هێنا . لە ئەنجامدا دیاردەی بێکاری و سەرهەلدانی مانگرتن و نارەزایی کرێکاری لەزۆربەی کۆمەلگا پیشەسازیەکانی تورکیا دا بەدواوە هات . ئەم بارەش راستەوخۆ رادەی بەرهەمهێنانی ولاتی کەم کردەوەو کرێکارێکی زوری تورکی ، بەمەبەستی دابین کردنی کار روویان لەئەوروپا کرد . هەموو ئەو دیاردەو گۆرانکارایانەش بووە مایەی کورت هێنانی بودجەی دەولەت بەشێوەیەکی بەرفراوان . جا بۆ چارەسەرکردن و پرکردنەوەو هاوسەنگی کردنی ئەو کورت

هێنانە . وای لە تورکەکان کرد ، کە پشت بە قەرزی بیانی ببەستن ، بۆ نموونە کورت هێنانی بودجەی بازرگانی لە ساڵی ١٩٦٧ خۆی لە (١٦٢) ملیۆن دۆلار دەدا ، کەچی دوای ١٩٧٧ گەیشتە (٤٠٤٣) ملیۆن دۆلار . واتە بەرادەی (٢٥٪) جار زیادی کرد . (٥٢/١٨) .

٤ ــ روخانی رژێمی شای ئێران و لەدەست دانی گەورەترین پایەگای ئەمریکا لە ناوچەکە . بۆ ئەمریکییەکان تورکیا گونجاوترین شوێن بوو . بۆ ئەوەی لەوێوە بەرپەرچی مەترسییەکانی هەردوو تەیاری چەپ و ئوسولی بدرێتەوە . هەربۆیە ش لە پێناوی زیاتر بە عەسکەری کردنی ژیانی سیاسی تورکیا و فراوان کردنی بنکە سەربازییەکانی ئەمەریکا لە ناوچەی رۆژهەلاتی تورکیا . بە حوکمی ئەوەی ئەو شوێنە هاوسنووورە لەگەڵ سۆڤیەت و ئێران ، کودەتای (١٢ ی ئەیلولی ١٩٨٠) بەسەرپەرشتی ژەنەرال کەنعان ئەفرین ئەنجام درا .

لە ئەنجامی شی کردنەوەی هۆکارەکانی ئەو (٣) کودەتایە ، دەگەینە ئەو راستیە ، کە دام و دەزگای دەستووری ولات ، کە خۆی لە پەرلەمانی تورکی دا دەدۆزێتەوە . چونکە لە ئەنجامی ئەو قەیرانانە نەیدەتوانی بەرەنگاری و بەرپەرچی لادانەکانی دەسەلاتی سیاسی ولات ببێتەوە . بۆیە سوپا لە رێگای ئەو کودەتا یەك لە دوای یەکانە یدا ، لە جیاتی دام و دەزگای دەستووری بەو کارە هەلدەستا ، ئەمەش ئەو راستیە دەردەخا ، کە سوپا خۆی بە تاکە هێزی شەرعی ولات دەزانێت و خۆی لە سەرووی هەردوو دەسەلاتی جێ بەجێ کردن و یاسادانان دادەنێت بەلکو سوپا لە رێگای هەر چوار دەستوری (١٩٢١ ، ١٩٢٤ ، ١٩٦١ ، ١٩٨٢) . کە خۆی داریژەریان بووە . ئەوەمان بۆ دوویات دەکاتەوە . کە دەسەلاتی یاسادانان و جێ بەجێ کردن بە تەواوەتی لە ژێر کۆنترۆلی سوپادا بووە و دەوری عەسکەری لە ژیانی سیاسی تورکەکان خستۆتە روو . دەستووری (١٩٢١ ، ١٩٢٤) لەسەردەمی باوکی سوپا ئەتاتورك داریژران ، دەستووری (١٩٦١) لەسەر دەستی تاقمی جەمال گورسیلی فەرماندەی کودەتای (١٩٦٠) هاتە کایەوە . دەستوری (١٩٨٢) دوای کودەتایەکەی کنعان ئیڤرین لە ساڵی (١٩٨٠) داریژرا ، کە تا ئێستا تورکەکان لە رێگای دەستووری (٤) مدا ولات بەرێوە دەبەن . ئەمەشیان دیسانەوە بالا دەستی سوپا دەردەخا لە بەرامبەر سیاسیەکانی ئەمرۆی تورکیا . سوپا لە رێگای دەستوورەکانی ملی بە سیاسیەکان کەچ دەکرد ، بۆ ئەوەی بەگوێرەی دیدو بۆچوونی عەسکەرەکان ، لە خزمەتی دەسەلاتی سیاسی میلتاری تورکیا دابن . جگە لەوە کاتێ سوپا لە کودەتای (١٢ مایسی ١٩٦٠) گەیشتە ئەو قەناعەتە ؛ کە دامودەزگای دەستووری ولات ، ناتوانێت رووبەرووی کێشە ناوخۆی و دەرەکیەکانی ولات ببێتەوە ، لە لایەك ، بۆ خزمەت کردنی ئامانجە عەسکەریەکان و دەسەلاتی میلیتاریانەی خۆی ، لە لایەکی ترەوە لە دوای کودەتای (١٩٦٠) بە چەند مانگ (ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەی تورکی) لە بەرامبەر پەرلەمانی تورکی قیت کردەوە و هەموو بریارە چارەنووسسازو گرنگەکانی ولاتی سەبارەت بە ئەمن و ئاسایشی ولات خستە ژێر رکێفی ئەو ئەنجومەنە نوێیەوە ئەم ئەنجومەنەش لە پاڵ ئەندامیەتی (سەرۆك کۆمارو

سه رۆك وه زیران و وه زیره كانی ده ره وه و ناوه وه و جه نگ . گشت ئه ندامه كانی تری ئه و ئه نجومه نه عه سكه ری بوون . سه رۆكی ئه ركانی گشتی و جێگره كه ی ، فه رمانده گشتی یه كانی هێزه كانی زه مینی و ئاسمانی و ده ریایی ، فه رمانده كانی جه ندرمه و هێزه كانی په ره شووت و فه رمانده ناوچه ییه كانی هێزه كانی سوویا ) و سه رۆكی ده زگای ئیستخباراتی (میت)(٣١٦/٢).

شایانی باسه پۆستی سه رۆكایه تی ئه م ئه نجومه نه له ده ست سه رۆكی ئه ركانی گشتی هێزه كانی توركیایه . هه روه ها پۆستی سكرتێری گشتی ئه و ئه نجومه نه ش به رده وام له ده ستی عه سكه ره كانه . واته ئه م ئه نجومه نه له شێوه ی په رله مانێك ده چێت ، كورسیه كانی ته نیا بۆ جه نه راله عه سكه رییه كانی سوپایه . جا بۆ زیاتر خستنه رووی كاریگه ریه تی ئه م ئه نجومه نه له بریاری سیاسی چاره نووسازو گرنگدا. چه ند نموونه یه ك باس ده كه ین . بۆ ئه وه ی زیاتر له ده وری سوپا له ژیانی سیاسی ئه مرۆی توركیادا بگه ین . هه ردوو كوده تای (١٩٧١، ١٩٨٠) به راسپارده و سه رۆكایه تی ئه و ئه نجومه نه بوو ، كاتی كنعان ئیڤرین كوده تای (١٢ ئه یلولی ١٩٨٠) ی به رپاكرد ، خۆی سه رۆكی ئه ركانی گشتی و سه رۆكی ئه و ئه نجومه نه بوو، جگه له وه هه ر له رێگای ئه و ئه نجومه نه وه ، هه موو (٦) مانگ جارێك ، داوا له په رله مانی توركیا ده كرێت ، كه بریاری مانه وه ی هێزه كانی هاوپه یمان له بنكه ی ئه نجه رلیك بۆ پاراستنی كورده كانی هه رێمی كوردستانی عیراق په سه ند بكات . كه پێشتر ئه نجومه نی ئاسایشی توركی ئه و بریاره ی په سه ندكرد . هه روه ها كاتی له (١٧/ ئاداری/١٩٩٣) دا ئۆجه لان سه رۆكی PKK بریاری ئاگربری یه كلایه نه ی راگه یاندو داوای گفتوگۆی سیاسی له توركه كان كرد بۆ چاره سه ركردنی كێشه ی كورد . تاكه لایه ن له توركیا كه مافی لێكۆلینه وه ی له و ده ستپێشخه ریه ی ئۆجه لان هه بوو ، ئه نجومه نی ناوبراوبوو ، دوای لێكولینه وه ی ئه نجومه نی ناوبراو له و بریاره ی ئۆجه لان . دانوستانی سیاسی له گه ل PKK ره تكرایه وه و ، ئه و ده ستپێشخه ریه ی ئۆجه لانیش ، به بێ هێزی PKK له قه له م درا . ئه وه ی جێگای سه رنج بێت په رله مانی توركی نه به چاك نه به خراپ خۆی له قه ره ی ئه و مه سه له گرنگ و چاره نووسسازه نه دا . ئه و ده ستپێشخه ریه ی ئۆجه لان له به رامبه ر ئه و نه رمییه ی ئۆزال بۆ چاره سه ری سیاسیانه ی كێشه ی كورد سه ری هه لدا . به لام مردنی ئۆزال له ٩٣/٤/١٧ ، واته به مانگێك دوای ده ستپێشخه رییه كه ، به هۆیه كی سه ره كی داده نرێت بۆ به ئاكام نه گه یشتنی ئه و دانوستانه . به لام مردنی ئۆزال له و كاتانه دا مایه ی گومان و سه رنجه . هه روه ك واش ده ركه وت كه ئۆزال به مردنی خۆی نه مردووه . واش مه زه نده ده كرا ، ئه گه ر نه مردبایه . ره نگه سوپا كوده تایه كی سپی دژی ئۆزال به رپا كردبایه . بێ شك نه مه ش بالاده ستی سوپا ده نوێنێ له بریاری سیاسی چاره نووساندا هه روه ها سه باره ت به كشانه وه ی هێزه كانی

تورکیا لەو سنووربەزاندنە فراوانەی ناوەراستی مانگی ئاداری ۱۹۹۵ بۆ سەر هەرێمی کوردستانی عیراق. دیسانەوە بالا دەستی عەسکەرەکانی تورکیامان بۆ دەردەخا. ئەوەش لەو لێدوانە جیاجیایانەی نێوان سیاسیەکان و وەزیری بەرگری تورکیا دەردەکەوێت سەبارەت بە وادەی کشانەوەی هێزەکانی تورکیا. سلیمان دیمریل سەرۆک کۆمار دەیووت ئەو هێزانە بۆ ماوەی سالێك لە هەرێمی کوردستان دەمێننەوە!! کەچی تانسو چیلەری سەرۆك وەزیرانیش دەیووت هێزەکانی تورکی بۆ چەند مانگێکی تر لە کوردستان دەمێننەوە!! هەروەها ئەردال ئینۆنۆی وەزیری دەرەوەش لە گەشتەکەیدا بۆ ولاتانی ئەورووپی هیچ زانیارییەکی ئەوتۆی لەبەر دەست نەبوو، کە کەی هێزەکانی تورکیا لە کوردستانی عێراق دەکشێنەوە! بەلام وەزیری بەرگری تورك دوای کۆبونەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی تورك، دوا بریاری کشانەوەی هێزەکانی لە ۱۹۹۵/۵/۱۵ دیاری کرد ئەمەش بێ ئاگایی سەرۆك کۆمارو سەرۆك وەزیران دەگەیەنی! هەر ئەوەش بوو دواتر ئەو بریارە جێ بەجێ کرا!! جگە لەوە زۆربەی دەزگا ئەمنیە گرنگەکانی ولات لە ژێر کۆنترۆلی عەسکەرییەکانن، دەزگای ئیستخباراتی نەتەوەیی (میت)، راستە راستەوخۆ پەیوەندی بە سەرۆك وەزیرانەوە هەیە، بەلام سەرۆکی ئەو دەزگایە یان پلەو پایەکەی عەسکەرییە یا عەسکەرییەکی خانەنشینە. هەروەها دەسەلاتی سەرۆکی ئەرکانی گشتی سوپای تورکی. گەورەترین پلەو پایەی سەربازییە تەواوی دەسەلاتی عەسکەری سوپاش لە دەست ئەودایە. چونکە پۆستی وەزارەتی بەرگری دەیەخشری بە مەدەنیەکان. کە ئەویش هیچ دەسەلاتێکی ئەوتۆی بەسەر سوپادا ناشکێ. بۆ سەلماندنی ئەو راستیەش ئەو گفتوگۆیەی نێوان جەنرال (دوغان غوریش)ی سەرۆك ئەرکان و سلیمان دیمریل سەرۆك کۆمار دەخەینە روو، سەبارەت بە درێژکردنەوەی مانەوەی ژنەرالی ناوبراو بۆ ماوەی سالێکی تر لە پۆستی سەرۆك ئەرکاندا. بۆ ئەوەی بتوانێ لە ماوەی ئەو سالەدا زەبرێکی کوشندە ئاراستەی هێزی سەربازی PKK بکات، ئەم ژەنەرالەش بە گەورەترین دوژمنی چارەسەری سیاسیانەی کێشەی کورد لە تورکیا دەژمێردرێت. وا دیارە چیلەری سەرۆك وەزیرانیش بەدوای چارەسەرێکی یاسایی دا دەگەرا بۆ مانەوەی ژەنەرالی ناوبراو لە پۆستەکەیدا. لەو کاتەدا دیمریل خۆی لە چیلەر تورە کردو گوتی ئەم کارە پێشێل کردنی دیموکراتیەتەو (هەموو کەسێکیش بە دیلی هەیە) بەلام ئەم لێدوانەی دیمریل دۆغانی هێنایە قسەکردن و بەرووی دیمریلدا تەقیەوەو وتی (مەدەنیەکانیش بە دیلیان هەیە)(۳٦/١٤) ئەم قسەیەش زورکار لە دیمیریل دەکات، چونکە تا

ئیستا سوپا دووجار دیمریلی لەسەر تەختی پۆستی سەرۆك وەزیران لە (١٩٦٠. ١٩٨٠) هیناوەتە خوارێ و بۆ ماوەی (١٠) سالیش کاری سیاسی لە دیمریل قەدەغە کردووە .

## تواناو قەبارەی تورکیا، لە سەردەمی ئەتاتورکەوە تا سالانی دوای جەنگی دووەمی جیهانی

تواناو قەبارەی سەربازی تورکیا بە چەند قوناغیکی جیاوازدا تی پەریووەو. بەگویرەی ئەو کیشە ناوخۆیی و گورانکارییانەی ناوچەکە گەشەی کردوەو قەبارەکەی زیادی کردووە، بەم پی یەش دەسەلاتی خۆی بەسەر سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەی ولاتدا رەنگی داوەتەوە، ئەتاتورك لە سەردەمی رزگاری نیشتمانیدا، سوپای تورکی لە سەر لاشەی سوپا شکست خواردووەکەی دەولەتی عوسمانی بنیاتنایەوە، هەر چەندە بە پی ی هودنەی (مودروس)ی نیوان ولاتانی هاوپەیمان و دەولەتی عوسمانی لە (٣٠ تشرینی یەکەمی سالی١٩١٨دا) سوپای عوسمانی زیاتر لە(١٤٥) هەزار تفەنگ و (١٨٦٧)تۆپی هەمەجۆرو (٦٨٢) رەشاشی، تەسلیم بە ولاتانی هاوپەیمان کرد (٢٦/٣). هیزەکانی هاوپەیمانان دەستیان بەسەر گرنگترین خالە عەسکەری و ستراتیجی و ئابووری یەکانی داگرت، هەردوو گەرووی دەردەنیل و بسفۆرو ئەستنبولی پایتەخت و ریگای شەمەندەفەری نیوان (بەغداو ـ ئەنادول). زوربەی ناوچەکانی باشوورو باکورو رۆژئاوای تورکیاش، کەوتە ژیرچەپوکی هیزی هاوپەیمانان، یونانیەکانیش لە (١٥ مایسی ١٩١٩دا) ناوچەی ئزمیرو کەنارەکانی رۆژئاوای تورکیایان داگیرکرد، سوپای تورکیاش هیزو توانای نیزامی خۆی لە دەست دا، بەلام لەو کاتەوە چەکدارە پەرش وبلاوەکانی سوپای عوسمانی لە ریگایی (کومەلەکانی بەرگری ـ جمعیات الدفاع) بە پاشماوەی چەکە سوکەکانی عوسمانی ،لەگشت ناوچە داگیرکراوەکاندا کەوتە شەری پارتیزانی لەدژی هاوپەیمانان، بەلام بە هاتنی ئەتاتورك بۆ ناوچەی ئەنادول، توانی لەو (کومەلە بەرگریانە) سوپایەکی نیزامی ریك بخاو لە (٢٣ ئاب تا ١٣ ئەیلولی ١٩٢١) رووبەرووی سوپای یونانیەکانی بکاتەوە. کە هەر (٥٠) کیلومەتریکیان مابوو بگەنە ئەنقرەی پایتەختی دەولەتە بچکولەکەی ئەتاتورك ،بەلام لە شەریکی (٣)هەفتەییدا ئەتاتورك توانی لە شەری (سقاریا)یەکەمین شکستی گەورە بە سوپای یونانیەکان بگەیەنی، هەرچەندە لەو کاتەدا شاری ئزمیرو زوربەی کەنارەکانی رۆژئاوای تورکیا لەژیر دەسەلاتی یونانیەکاندا بوو، بەلام کەمالیەکان هەر لە (٢٦)ی ئابەوە تا ٩ ئەیلولی ١٩٢٢)، واتە دوای سالیك لە شەری (سقاریا) توانیان لەچەند شەریکی قورسدا خۆیان

بگه یه ننه سه ر که ناره کانی روژئاواو سوپای یونانی له ولات ده ریه رینن و له ئه نجامدا (٧٥) هه زار سه ربازی یونانیه کان کوژران و (٢٧) هه زار سه ربازی یونانیش به دیل گیران و له نیو دیله کاندا زیاتر له (٥٠٠) ئه فسه رو ژه نه رالی یونانی هه بوون، ئه مه جگه له وه ی تورکه کان چه کیکی زورو جبه خانه یه کی زوری سوپای یونانیان که وته ده ست (٣٦/٣) چه ك و جبه خانه کانی سوپای یونانیش چه کی کاریگه رو به توانابوون، چونکه سوپای یونانی به چه ك و جبه خانه ی به ریتانی و ولاتانی هاوپه یمان پرچه ك کرابوو، لیره دا ده گه ینه ئه و راستیه، که سه رچاوه ی چه کی سوپای تورکیا له سه رده می جه نگی رزگاری نیشتمانیدا ،له پاشماوه ی چه که کونه کانی سوپای عوسمانی و چه که ده سکه وتوه کانی شه ری دژ به یونان و یارمه تیه ئابووری و عه سکه ریه کانی به لشه فیه کانی رووسیا پیك هاتبوو، که به پێ ی په یمانی مۆسکۆ له (١٦ ی ئازاری ١٩٢١) تورکه کان ئه و یارمه تیانه یان به مه به ستی سه رکه وتنی شورشی رزگاری نیشتمانی له به لشه فیه کان ده سته به ر کردبوو (٥٥/٤)، جگه له وه ش پاش سه رکه وتنی سوپای تورکیا له شه ری (سقاریا) به سه ر یونانی یه کان و له ئه نجامی ناکۆکی نیوان ولاتانی هاوپه یمان، به مه به ستی دابینکردنی به رژه وه ندییه کانی خۆیان، فه ره نسیه کان له (٢٠) تشرینی یه که می ١٩٢١ دا، ریکه وتننامه یه کیان له گه ل تورکه کان موورکرد، به گویره ی ئه و ریکه وتنامه یه فه ره نسیه کان له به رامبه ر ده ست داگرتنیان به سه ر میناى ئه سکه نده رونه، دانیان به سه ربه خویی حکومه تی ئه نقه ره ناو له ناوچه ی کلیکیاش کشانه وه.

هه روه ها بایی (٢٠٠ میلون فره نکی فه ره نسیش چه ك و جبه خانه یان فروشته تورکه کان و زیاتر له (٨٠) هه زار سه ربازی تورکیشیان ئازادکرد و له په یمانی سیڤه ریش په شیمان بونه وه (٣٦/٣). پیش وه ختیش ئیتالیه کان له ئابی ١٩٢١ دا، له به رامبه ر به خشینی خه لوزی به ردین بو ماوه ی (٢٠) سال له لایه ن تورکه کانه وه به ئیتالیه کان، سوپای ئیتالیا له ناوچه ی (ئیزالیا) ی تورکیا پاشه کشه ی کردو دانی به سه ربه خویی حکومه تی ئه نقه ره نا، پاشه کشه ی فه ره نسیه کان فاکته ریکی گرنگ بوو، بۆ ئه وه ی تورکه کان پشت له به ره کانی خواروری ولات بکه نه وه و هیزه کانی خویان له و به ره یه وه به ره و به ره کانی دژ به یونانی یه کان ئاراسته بکه ن و دواتر به سه ر یونانی یه کان سه ربکه ون، واته لیره دا بومان ده رده که ویت سوپای تورکیا له و ریگایانه وه سه رچاوه کانی چه کی بو شه ری رزگاری نیشتمانی دابین کردو یونانیه کانیش له ولات ده ریه رینی دواتریش یه که یه که ی ولاتانی هاوپه یمان دان به سه ربه خویی تورکه کاندا بنێن، ئه وه ی لیره دا جیگای سه رنج بیت ئه وه یه، که ولاتانی هاوپه یمان به تایبه تی

ئینگلیزه‌کان زۆربه‌ی خاکی تورکیایان داگیرکردبوو، به‌لام هیچ کام له‌و هێزانه به‌ره‌یه‌کی ئه‌وتۆی شه‌ڕیان له‌دژی تورکه‌کان نه‌کرده‌وه‌و له‌و کاته‌دا ته‌نیا یۆنانی یه‌کان دژی تورکه‌کان ده‌جه‌نگان! بۆیه لێره‌دا پرسیارێک خۆی به‌سه‌ر باسه‌که‌دا فه‌رز ده‌کات، ئه‌ویش ئه‌وه‌یه، ئایا بۆچی هێزه‌کانی هاوپه‌یمانان هیچ به‌ره‌یه‌کی تری شه‌ڕیان بۆ ئه‌تاتورك نه‌کرده‌وه؟ بۆ وه‌لامی ئه‌م پرسیاره ده‌گه‌ینه ئه‌و لێکدانه‌وه‌یه، له‌وانه‌یه ئینگلیزو فه‌ره‌نسا و ئیتالیا، به‌هۆی ماندووبوونیان له‌جه‌نگی گیتیی یه‌که‌مه‌وه، گشت توانای خۆیان له‌پشتگیری کردنی سوپای یۆناندا خستبێته‌گه‌ر، هه‌ر بۆیه هێزه‌کانی هاوپه‌یمانان چاوه‌ڕێی به‌ئاکام گه‌یشتنی شه‌ره‌کانی نێوان یۆنان و تورکه‌کان بوون، کاتیکیش یۆنانی یه‌کان شکستیان هێنا، ئیتالیه‌کان و فه‌ره‌نسیه‌کان به‌بێ شه‌ر تورکیایان جێ هێشت، ئینگلیزه‌کانیش به‌هه‌مان شێوه له‌ڕێگای په‌یمانی لۆزان له‌(۲۳ تشرینی یه‌که‌می ۱۹۲۳)تورکیایان جێ هێشت و دانیان به‌سه‌ربه‌خۆیی تورکه‌کاندا نا، ئه‌م هه‌لویست گۆڕینه‌ی هاوپه‌یمانان له‌و توندوتیژییه‌ی له‌په‌یمانی (سیڤه‌ر) ده‌رهه‌ق به‌تورکیا ده‌یاننواند، بۆ ئه‌و نه‌رمیه‌وه ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ دوای ده‌ست تێوه‌ردانی به‌لشه‌ڤیه‌کان له‌کاروباری تورکیاو پشت گیری کردنیان له‌ئه‌تاتورك و جه‌نگه‌ ره‌واکه‌ی دژی هاوپه‌یمانان. هاوپه‌یمانان زۆر ژیرانه هه‌ولیاندا، هه‌ستی کلپه‌سه‌ندوی شۆڕشگێرانه‌ی تورکه‌کان له‌وه زیاتر نه‌ورووژێنن بۆ ئه‌وه‌ی تورکیا زیاتر نه‌خرێته نێو باوه‌شی به‌لشه‌ڤیه‌کانه‌وه، یانیش له‌وانه‌یه به‌هۆی ئه‌و په‌یوه‌ندی‌یه نهێنی یه‌ی نێوان ئه‌تاتورك و ئینگلیزه‌کان بگه‌ڕێته‌وه!! له‌و کاته‌وه سوپای تورکیا پشتوێنه‌کی هاته‌وه به‌ر، ئه‌ویش به‌یارمه‌تی و پالپشتی به‌لشه‌ڤیه‌کان له‌ڕێگای په‌یمانی دۆستایه‌تی و بێ لایه‌نی که‌له (۱۷ کانونی یه‌که‌می ۱۹۲۵) له‌نێوان تورکیاو یه‌کیتی و سوڤیه‌ت بۆ ماوه‌ی (۱۰) سال مۆرکراو ئه‌گه‌ری نوێکردنه‌وه‌ی تێداخرا بووه‌ڕوو (۲۰/۲) ئه‌م په‌یمانه سه‌ره‌تایه‌کی نوێ بوو بۆ پرچه‌کردنی سوپاو ئابووری تورکی به‌چه‌ك ودراوی به‌لشه‌ڤی، په‌یمانه‌که‌ش تا سالی (۱۹۳۵) به‌رده‌وام بوو، هه‌ر له‌و سالە‌شدا بۆ ماوه‌ی (۱۰) سالی تر نوێ کرایه‌وه (٥٥/٤).

دوای کۆتایی هاتنی جه‌نگی دووه‌می جیهانیش ئه‌م په‌یمانه له‌لایه‌ن ستالینه‌وه ره‌تکرایه‌وه،به‌لام دوابه‌دوای ته‌واوبوونی په‌یمانی لۆزان. تورکه‌کان به‌شێوه‌یه‌کی تر که‌وتنه خۆ بۆ دارشتنه‌وه‌ی سیسته‌می سیاسی ولات و تۆندوتۆل کردنی قه‌واره‌ی سیاسی تورکیا. ئه‌تاتورکیش له‌سه‌ر چه‌ند بنه‌مایه‌کی سه‌ره‌کی ده‌ستورێکی نوێتری بۆ ولات دارشت، که‌ دووربێ له‌ده‌ست تێوه‌ردانی زلهێزه‌کانی ناوچه‌که، چونکه ئه‌و ده‌ستوری سالی (۱۹۲۱)ی به‌گوێره‌ی خواستی

پەیمانی سیڤەر (١٩٢٠) دارشتبوو، کە زۆربەی برگەکانی دەستوری سالی (١٩٢١) دژایەتی بۆچوون و ئامانجەکانی ئەو (٦) بنەمایەی خۆی بوون، لەهەر کیشەکانی بەعلمانی کردنی دەولەت و نەتەوەکانی نێو تورکیاو (خلافە) و باری ئابووری ولات و هەندی کیشەی تر.

ئەوە بوو پەرلەمانی تورکیا لە (٢٠ نیسانی ١٩٢٤). لە چوارچیوەی هەر (٦) بنەماکەی ئەتاتورك بریاری لە سەر دەستوری نوێی ولاتدا. لە دەستوری نوێدا بەگویرەی بنەمای (قەومیەت) جگە لە نەتەوەی تورك هیچ نەتەوەیەکی تر لە تورکیا بەدی نەدەکراو زمانی تورکیش بەزمانی رەسمی دەولەت لەقەلەم درا، ئەمەش سەرەتایەك بوو بۆ تواندنەوەی ئەو نەتەوانەی کە بەنەژاد تورك نین لە بۆتەی نەتەوەی بالادەستی تورکدا.

ئەم کارەی ئەتاتورکیش بووە مایەی بەرەنگاربوونەوەی لەگەل گەلی کورددا، بۆیە لەو کاتە بەدواوە، تاکە کیشەی سوپا، کیشەی کوردەکانی باشووری رۆژهەلاتی ولات بوو. چونکە لە دەستوری سالی (١٩٢١) پەرلەمانی تورکی .دانی بەبوونی نەتەوەی کورد نابوو. هەروەك خەتیب دجلەی نوینەری حزبی DEP، لە پەرلەمانی تورکی دەلیت: ـ پەرلەمانی تورکی پیش (٧٥) سال بەهاوبەشی هەردوو گەلی کوردو تورك .لەگەل ئیمزاکردنی پروتوکولی ئەماسیا وبەستنی کونگرەی ئەرزەرۆم و سیواس دامەزرا، ئامانجەکانی ئەو کونگرەیەش پاراستنی خاکی هەردوو گەلی تورك و کوردو دامەزراندنی دەولەتی هاوبەش بوو. کە تیایدا بەیەك پیوانە مافی هەموو لایەك بەقەدەر یەك تیا پاریزراو بیت، هەر لە چوارچیوەی ئەو بۆچونەشدا، مستەفا کەمال لە یەکەم لیدوانی بو پەرلەمانی تورکی وتی: میثاقی نەتەوەیی مانای (ئەو سنوورە نەتەوەییە کە برایەتی میللەتی تیا دیتەدی .لەناو ئەو سنوورەش تورکەکان هاوشانی کوردەکان پیکەوە دەژین. بۆیە پیویستە ئەو گەلانەش مافی یەکتر بپاریزن» هەر لە سەر ئەو ریچکەیەش بوو دەستووری (١٩٢١) هیچ جورە ئیمتیازیکی تایبەتی بو نەتەوەی تورك دیاری نەکردو تورکیاشی بەتەنها بەولاتی تورکەکان نەژمارد. بەلکوبەولاتی گشت ئەو نەتەوانەی دانا کە لەسەر خاکی تورکیا دەژین(١/٢٠) بویە دەتوانین بلیین. لەو کاتەدا لەسەردەمی شورشی رزگاری نیشتمانی تورکیادا، کوردەکان هاوشان لەگەل ئەتاتورك دژی داگیرکەران جەنگاون. لەسالی ١٩١٩دا کاتی کووبونەوەیەکی ریکخراوە نیشتمانیەکان و ریکخراوەکانی بورژوازی نیشتمانی کرا .لەویدا «کومەلەی پاراستنی مافی ئەنادولی رۆژهەلات» دامەزرا و ئەوکوبونەوەیە لە (ئەرزەرۆم) بەسترا، هەندی لە دەستەو تاقمی تیگەیشتووی کورد بەچەشنیکی زۆر کاریگەر تێیدا بەشداربوون و بەهەموو تواناوە پشتیوانی

تورکه کانیان ده کرد ، له خه باتی رزگاریخوازی نیشتمانی و دژایه تی ئیمپریالزمدا چونکه پێ یان وابوو سه رکه وتنی ئه و خه باته له وانه یه گه لی کوردیش به مافه نه ته وایه تیه کانی بگه یه نێ ، ئه نجومه نی گه وره ی نیشتمانی تورکیا له سالی ۱۹۲۰ له (ئه نقه ره) کۆبووه ، (۷۲) نوینه ری کوردی تیادا به شداربوون وبه ناوی نوینه رانی کوردستانه وه هاوکاری مسته فا که مالیان ده کرد ، (٥٦،٥٥/٧) به لام وا دیاره تورکه کان پاش ئه وه ی توانیان ولاتی هاوپه یمان له ریگای په یمانی لوزان ، له په یمانی (سیڤه ر) سه باره ت به چاره سه ری کیشه ی کورد په شیمان بکه نه وه ، ده ستیان دایه سیاسه تی (تتریك) کردنی کورده کان . کورده کانیش له به رامبه ر ئه م جوره سیاسه ته ، له سالی (۱۹۲٥) راپه رینی چه کدارییان له دژی ئه تاتورك له ناوچه کانی باشووری روژهه لات بو به ده ستهینانی مافه نه ته وایه تیه کانیان به رپاکرد ، سوپای تورکیش له و ساله دا به (۳٥) هه زار سه ربازو (۱۲) فروکه ی جه نگی که وته گیانی ئه و راپه رینه و به زه بری ئاگرو ئاسن کوژاندیه وه ، له و شالاوه یدا (۲۰٦) گوندی ویران کردو (۸,۷٥۸) خانووی سوتان و (۱٥,۲۰۰) که سیشی کوشت (٦١/٧) ، له و کاته وه سوپای تورکی تا ئیستا رووبه رووی گه وره ترین و ترسناکترین کیشه ی ناوخویی بوته وه راپه رینی کورده کان هه ر له وی نه وه ستا ، به لکو له دوای (۱۹۲٥) چه ندین راپه رینی تری وه ك (۱۹۳۰_۱۹۳٦) ی به دوا داهات ، جا بو ته فرو توناکردنی ئه و راپه رینانه ش بێ شك سوپا پیویستیه کی زوری به چه ك و جبه خانه ی سوپایی هه بوو بو ئه وه ی بتوانێ په ره به جه نگه که ی بدات . له و کاتانه شدا ، ته نیا سه رچاوه ی چه ك و جبه خانه ی جه نگی سوپای تورکیا سوڤیه ت بوو ، بو سه لماندنی ئه و راستیه ش ، سوڤیه ت له سالی ۱۹۲٥ په یمانی دوستایه تی و بێ لایه نی بو ماوه ی (۱۰) سال له گه ل تورکه کان مورکرد ، هه ر له چوارچیوه ی ئه وپه یمانه ش دا له سالی (۱۹۳٤) تورکیا بو پوشته کردنی کارگه پیشه سازییه کانی (۸) ملیون دولاری وه ك یارمه تی ، به بێ قازانج له سوڤیه ت وه رگرت ٥٥/٤

ئایا ئه و یارمه تی دانه ی سوڤیه ت له و کاته دا مانای ئه وه ناگه یه نێ ، که سوڤیه ت رازییه به لیدانی کورده کان ؟!

جا له ده رئه نجامی ئه م شه ره به رده وامه دژی کورده کان سوپا به ته واوه تی حوکمی میلیتاریانه ی خوی به سه ر تورکیا داسه پاندو ، له و کاته وه تا ئیستا به فعلی سی یه کی خاکی تورکیا که وته ژیر پوستالی عه سکه ری یه کانه وه،لیره داچه ند پرسیاریك دیته ئاراوه ، ئایا ئه گه ر (۳٥) هه زار سه رباز ته نیا بو دامرکاندنه وه ی راپه رینی کورده کان به کارهاتبی ، ده بیت ریژه ی گشتی سوپا له و کاته دا چه ند زه به لاح بوو بیت ؟! ئایا ژیر خانیکی دا ته پیوی ئابووری

له ئه نجامی شی کردنه وه ی هۆکاره کانی ئه و (٣) کوده تایه، ده گه ینه ئه و راستیه، که دام و ده زگای ده ستووری ولات، که خۆی له په رله مانی تورکی دا ده دۆزێته وه. چونکه له ئه نجامی ئه و قه یرانانه نه یده توانی به ره نگاری و به ربه رچی لادانه کانی ده سه لاتی سیاسی ولات ببێته وه. بۆیه سوپا له رێگای ئه و کوده تا یه ك له دوای یه کانه یدا، له جیاتی دام و ده زگای ده ستووری به و کاره هه لده ستا، ئه مه ش ئه و راستیه ده رده خا، که سوپا خۆی به تاکه هێزی شه رعی ولات ده زانێت و خۆی له سه رووی هه ردوو ده سه لاتی جێ به جێ کردن و یاسادانان داده نێت به لکو سوپا له رێگای هه ر چوار ده ستوری (١٩٢١، ١٩٢٤، ١٩٦١، ١٩٨٢). که خۆی دارێژه ریان بووه. ئه وه مان بۆ دوو پات ده کاته وه، که ده سه لاتی یاسادانان و جێ به جێ کردن به ته واوه تی له ژێر کۆنترۆلی سوپادا بووه و ده وری عه سکه ری له ژیانی سیاسی تورکه کان خستۆته روو. ده ستووری (١٩٢١، ١٩٢٤) له سه رده می باوکی سوپا ئه تاتورك دارێژران، ده ستووری (١٩٦١) له سه ر ده ستی تاقمی جه مال گورسیلی فه رمانده ی کوده تای (١٩٦٠) هاتـه کایـه وه. ده ستوری (١٩٨٢) دوای کوده تایه که ی کنعان ئیڤرین له سالی (١٩٨٠) دارێژرا، که تا ئێستا تورکه کان له رێگای ده ستووری (٤) مدا ولات به رێوه ده به ن. ئه مه شیان دیسانه وه بالا ده ستی سوپا ده رده خا له به رامبه ر سیاسیه کانی ئه مرۆی تورکیا. سوپا له رێگای ده ستووره کانی ملی به سیاسیه کان که چ ده کرد. بۆ ئه وه ی به گوێره ی دیدو بۆچوونی عه سکه ره کان، له خزمه تی ده سه لاتی سیاسی میلتاری تورکیا دابن. جگه له وه کاتێ سوپا له کوده تای (١٢ مایسی ١٩٦٠) گه یشته ئه و قه ناعه ته؛ که دامو ده زگای ده ستووری ولات، ناتوانێت رووبه رووی کێشه ناوخۆی و ده ره کیه کانی ولات ببێته وه، له لایه ك، بو خزمه ت کردنی ئامانجه عه سکه ریه کان و ده سه لاتی میلیتاریانه ی خۆی، له لایه کی تره وه له دوای کوده تای (١٩٦٠) به چه ند مانگ (ئه نجومه نی ئاسایشی نه ته وه ی تورکی) له به رامبه ر په رله مانی تورکی قیت کرده وه و هه موو بریاره چاره نووسسازو گرنگه کانی ولاتی سه باره ت به ئه من و ئاسایشی ولات خسته ژێر رکێفی ئه و ئه نجومه نه نوێ یه وه ئه م ئه نجومه نه ش له پال ئه ندامیه تی (سه رۆك کۆمارو سه رۆك وه زیران و وه زیره کانی ده ره وه و ناوه وه و جه نگ. گشت ئه ندامه کانی تری ئه و ئه نجومه نه عه سکه ری بوون. سه رۆکی ئه رکانی گشتی و جێگره که ی، فه رمانده گشتی یه کانی هێزه کانی زه مینی و ئاسمانی و ده ریایی، ئه وسای تورك. که تازه له دوو جه نگ هاتبیته ده رێ، چون یه رگه ی

پیداویستیه‌کانی سوپایه‌کی وا زه‌به‌لاحی گرتووه؟! ئایای ئه‌مه مانای ئه‌وه ناگه‌یه‌نێ که‌ره‌وتی میلیتاری‌کردنی ولاتی تورکیا له‌و کاته‌وه سه‌رچاوه‌ی گرتبێ و ئیستاش سه‌ره‌رای باری خراپی ئابووری ولات په‌ره به‌داموده‌زگای ئه‌و سوپا زه‌به‌لاحه ده‌درێ؟!

به‌لام سالی ۱۹۳۹، سالیکی گرنگه له‌وه‌رچه‌رخانی زیاتری پرچه‌ك‌کردن و زیادکردنی ریژه‌ی توانای سه‌ربازی تورکیا. چونکه له‌و ساله‌دا جیهان که‌وته نیو ئاشوبی جه‌نگی گیتی دووه‌مه‌وه، هه‌رچه‌نده تورکیا، به‌هیزه‌کانی خوی به‌شداری جه‌نگه‌که‌ی نه‌کردو گوێ‌رایه‌لی راسپارده‌ی (ئاشتی له‌ناوه‌وه، ئاشتی له‌ده‌ره‌وه)ی ئه‌تاتورك بوون و تا روژانی کوتایی جه‌نگ خویان نه‌کرده لایه‌ن له‌و جه‌نگه‌دا.

به‌لام دله‌راوکێی تورکه‌کان له به‌شداری‌کردن و به‌شداری‌نه‌کردن، له‌به‌ره‌به‌ری کوتایی جه‌نگ نه‌ماو خویان دایه پال ولاتانی هاوپه‌یمان، که‌چی سوپای تورکیا له‌یه‌که‌م روژی جه‌نگه‌وه تاکوتایی جه‌نگ له حاله‌تی ئاماده‌باشی دابوو، هه‌ر که‌سیك سه‌ردانی تورکیای کردبایه له‌و کاتانه‌دا، بوی ده‌رده‌که‌وت، که تورکیاش وه‌ك هیزیکی به‌شداربووی جه‌نگ مامه‌له‌ی ده‌کردو نزیکه‌ی (۱) ملیون سه‌ربازی بو ئه‌و مه‌به‌سته‌ش ئاماده کردبوو، (۴۵/۳). هه‌روه‌ها له‌هه‌مان سالدا (۱۹۳۹) بو یه‌که‌مین جار له‌کاتی ئاشتی بودجه‌ی تایبه‌ت بو سوپا ته‌رخان کرا، که ئه‌مه‌ش بووه باریکی گران به‌سه‌ر ئابووری ولاته‌وه (۷۱/٤)، به‌لکو له سالی ۱۹٤۲ (۳۲۰) ملیون لیره بو بودجه‌ی عه‌سکه‌ری ته‌رخان کرا، واته (۳) به‌شی داهاتی ده‌وله‌ت له‌و ساله‌دا. (۴۵/۳)، ئه‌م ئاماده‌باشیه‌ی تورکه‌کانیش خوی له گرنگی و ستراتیجی شوینه‌که‌یان ده‌دوزییه‌وه، که ئه‌ویش خاوه‌نداریه‌تی هه‌ردوو گه‌رووی بسفوورو ده‌رده‌نیله، که ده‌یتوانی به‌هوی ئه‌و شوینه‌یه‌وه (پارسه‌نگی هیزه‌کان)ی شه‌ر بگورێ. ئه‌مه‌ش وای له‌تورکه‌کان کرد، که‌به‌رده‌وام له ماوه‌ی جه‌نگی جیهانی دووه‌مدا چاوه‌رێ‌ی په‌لامار‌دانی یه‌کیك له لایه‌نه شه‌رکه‌ره‌کان بن، به‌تایبه‌تی ئه‌لمانیا، هه‌ر ئه‌و ترسه‌ش بوو وای له‌تورکه‌کان کرد، که په‌یمانی دوستایه‌تی و په‌لامارنه‌دانی یه‌کتر له ۱۹٤۱/٦/۱۸ موربکات و له‌کاتی جه‌نگدا ریگا به (باریجه) جه‌نگه‌یه‌کانی ئه‌لمانیا بدات له‌گه‌روه‌کانی ته‌راتێن بکات، هه‌روه‌ها نیوه‌ی که‌ل‌وپه‌له نیردراوه‌کانی خوی له نیوان سالانی ۱۹٤۱ تا ۱۹٤۲ بو ئه‌لمانیا بنیری (۴۵/۳)، ئه‌م خو ئاماده‌کردنه‌ی سوپای تورکیاش له‌سه‌ره‌تای جه‌نگ وه‌ك زه‌روره‌تیك خوی هینایه پیشه‌وه کاتی ئه‌لمانیا له (۲۳ ئابی ۱۹۳۹) په‌یمانی بێ‌لایه‌نی کردنی سوڤیه‌تی له‌جه‌نگ له‌گه‌ل سوڤیه‌ت مورکرد(۲۹٦/۸)، ئه‌وه بوو تورکه‌کان ترسیکی زوریان لێ نیشت، به‌تایبه‌تی له

ئامانجە ستراتیژی یەکانی سوڤیەت بو گەیشتن بە ئاوە گەرمەکان. کە ئەو ئامانجەی سوڤیەتیش لە داگیرکردنی هەردوو دورگەی دەردەنیل و بسفور خۆی دەنواند، جگە لەوە فەرەنساو بەریتانیاش بەهەمان شیوە ترسیان لەو پەیمانە نوێ یەی سوڤیەت و ئەلمانیا لا پەیدا بوو.

جا بو ئەوەی ریگا لەو مەترسیە گەورەیە بگرن و هەروەها چاودیری بازرگانی سوڤیەت و ئەلمانیا لە دەریای رەش بکەن، لە (تشرینی یەکەمی ١٩٣٩) واتە دوای مانگیك و هەفتەیەك لەو پەیمانەی سوڤیەت و ئەلمانیا، بەریتانیا و فەرەنسا پەیمانی هاریکاریان لەگەل تورکیادا مورکرد، بەگویرەی ئەو پەیمانە، هەردوو ولات بەلینی یارمەتی دان و فریاگوزاری تورکەکان دەکەن، کاتی دووچاری هیرش کردنە سەر هات لە لایەن ولاتیکی ئەورویی (واتا ئەلمانیا)، هەروەها هەر کاتیکیش شەر گەیشتە دەریای سپی ناوەراست، تورکیا یارمەتی ولاتانی هاوپەیمان دەدات. (٦٥،٦٤/٤)، هەرچەندە وەك پیشتر ئاماژەمان بو کرد، تورکیا سەرەرای مورکردنی ئەو پەیمانانەی لەگەل هاوپەیمانان، پەیمانی دوستایەتی لە سالی ١٩٤١ لەگەل ئەلمانەکان مورکرد. بێ شك وا دیارە تورکیا دەیەویت خۆی لە گیچەلی ئەلمانیا بپاریزیت بەتایبەتی پاش ئەوەی دەستی بەسەر ولاتانی بەلقان و ئەورویای ناوەراست داگرت و ئاگری شەری ئەلمانەکانی لێ نزیك کەوتەوە.

بەلام لەو کاتەدا واتە لە سالی ١٩٣٩، تورکیا پیویستی بە یارمەتی و هاریکاری هاوپەیمانان هەبوو، هەروەك لە پیشەوە ئاماژەمان بو کرد، هەروەها بو ئەوەی بتوانی لەو ریگایەوە یارمەتی ئابووری و عەسکەری بو سوپا (١) ملیونەکەی دابین بکات، بەتایبەتی بودجەی تورکیا بەهیچ شیوەیەك توانای بەخیوکردن و پرچەك کردنی (١) ملیون سەربازی نەبوو. بویە ئەگەر بێتو سەیری بری ئەو یارمەتیانە بکەین کە بەگویرەی ئەو پەیمانە دەستی کەوتوە، یارمەتیەکی باشی باری ئابووری تورکەکانی داوە، ئەو ریکەوتنە بو ماوەی (١٥) سال بەردەوام بوو. وە کومەلیك ریکەوتنی دارایی پیوەگری درابوو، تورکیا بەگویرەی ئەو ریکەوتنە داراییانە (٢٥) ملیون جونەیهی ئیستەرلینی بو کرینی پیداویستی جەنگی لە فەرەنساو بەریتانیا وەرگرت، هەروەها قەرزیکی (١٥) ملیون جونەیهی زیریشی پیدرا، لەگەل ریژەیەکی تر کە خوی لە (٣٥) ملیون جونەیهی ئیستەرلینی دەدا، بو یەکلاکردنەوەی قەرزە بازرگانیە دەستبەسەرداگیراوەکانی لە فەرەنساو بەریتانیا، (٢٤/٢) هەروەها ئەمریکاش بەپێی یاسای (التعویض والتأجیر) لە سالی ١٩٤١ وە تاکوتایی هاتنی جەنگ نزیکەی (٩٥) ملیون دولاریان وەك یارمەتی سەربازی پیشکەش بە تورکەکان کرد (٧٤/٤)، بەگویرەی پەیمانی ١٩٣٩ لەو کاتەوە تا کوتایی هاتنی جەنگ، ئەرکی دابینکردنی چەك و پارەی پیویست بو

سوپای تورکیا بە شێوەیەکی سەرەکی کەوتە ئەستۆی بەریتانیا .

دوای جەنگیش کاتێک باری ئابووری بەریتانیا بەرەو خراپی رۆیشت ، هەروەك پێشتر لەم نوسینەدا باسمان کرد داوای لە ئەمریکا کرد ، کە لەمەودوا ئەرکی یارمەتی دانی یونان و تورکیا بگریتە ئەستۆ . بۆیە دەتوانین بڵێین لە سالانی (١٩٤٧_١٩٩٤)(٨٠٪) بودجەی سوپای تورکی لەلایەن ئەمریکاوە بەبەردەوامی دابین کراوە .

هەروەك ولیەم هارتونگی پسپۆری کونترول کردنی چەك و ئامادەکاری راپورتی ئەنستیوتی سیاسەتی دەولی ، بو بەکارهینانی چەکی ئەمریکی لە دژی کوردەکانی تورکیا ، لەم ماوەیەدا ئاشکرای کرد کە ٨٠٪ ی پێداویستی تورکیا لە چەك ، لە ئەمریکاوە دابین دەکرێ (١/١٩) .

## تواناو قەبارەی سوپا لەدوای سەرهەڵدانی کێشە ناوخۆیی و ئیقلیمی یەکانی تورکیا

زەبەلاح کردن و پڕ چەك کردنی سوپای تورکیا، بە باشترین کەرەستە و ئامێرو ماشێنی جەنگی ، خۆی لە بەرەنگاربوونەوەی دوو مەترسیدا دەدۆزیەوە .

یەکەمیان: بەترسی سۆڤیەت ، کە گەشەپێدانی سوپای تورکی بە داخوازی یەکی دەرەکی دادەنرا ، بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەترسی سۆڤیەت ، بە تایبەتی ئەم بۆچوونە لەلایەن ئەمریکاوە پێ ی لەسەر دادەگیرا .

دووەمیان: مەترسی لە کێشە ناوخۆیی و ناوچەییەکانی دەوروبەری تورکیا ، ئەم پڕ چەك کردنەش بە داخوازییەکی ناوەوە دادەنراو لەلایەن خودی تورکەکانەوە پێ ی لەسەر دادەگیرا ، ئەمەش مانای ئەوە نی یە کە دەرەوە چاوی لە مەترسیەکانی کێشە ناوخۆیی و ئیقلیمی یەکانی تورکیا پۆشیبێ و هیچ کارێکی بۆ نەکردبێ ، بەلام ئەگەر کرابێتیش ، هەولی پارسەنگی هێزە ئیقلیمی یەکانی داوەو نەیویستوە ئەو پارسەنگی یە لاسەنگ بێ ، جگە لە سۆڤیەت بە هیچ لایەکی تردا بشکێتەوە، بۆ نمونە ئەمریکا بۆ ئەوەی پارسەنگی هێزی عەسکەری نێوان یۆنان و تورکیا بپارێزێت و مەترسی شەڕو پێکدادان لە نێوان ئەو دوو وڵاتە روونەدات و هیچ لایەك لە لایەکی تر توانای سەربازی زیاتر نەبێت . لە سالانی ٧٠ بەم شێوەیە پارسەنگی تواناو قەبارەو جۆری چەکەکانی نێوان هەردوولای پاراست ، هەرچەندە تورکیا بە رێژەو ژمارەی دانیشتوان لە یۆنانەکان زیاتر بوو .

به لام له ریژه ی چه ك و جوری چه ك هیچ لایه ك له لایه كی تر چه ك و توانای سه ربازی زیاتر نه بوو ، ژماره ی دانیشتوانی یونان له سالانی ٦٠ (٨,٩٠٠,٠٠٠) كه س بوو ، هیزی ئاسمانیشی له (٢٢٥) فروكه ی جه نگی ئه مریكی پیك هاتبوو ، هه روه ها هیزی ده ریاییشی له ١٣ مدمره و ٧ پاپوری پاراستنی كه ناركان پیك هاتبوو ، كه چی ژماره ی دانیشتوانی توركیا (٣٧,٩٠٠,٠٠٠) كه س بوو ، هیزی ئاسمانی توركه كان له ٢٢٨ فروكه ی جه نگی هیزی ده ریاییشی ١٤ مدمره و ٨ پاپوری پاراستنی كه ناره كان پیك هاتبوو ، هه روه ها ئه مریكا بو ئه وه ی هیزی ئاسمانی هیچ لایه ك له وی تر زیاتر نه بی ، ئه وا به قه ده ر یه ك چه كیان پی ده فروشی ، بو نمونه ئه مریكا له سالی ١٩٧٢ هه ر ولاته ی به قه ده ر یه ك ٤٠ فروكه ی جه نگی جوری فانتومی پی فروشتن (١٨٢/٢)، سه باره ت به مه ترسی یه كه م ئه مریكا زور ژیرانه سوپای توركی بو ئه و كاره ئاماده كردبوو ، جگه له وه ئه مریكا له پال ئه و هیزه ی توركیا، هیزه كانی خوی زور به باشی له ناوچه كه و له ناو توركیا ، له ریگای بنكه سه ربازی و جاسوسی یه كانیه وه به سه ر سوڤیه ت ، كه خوی له ١٣٤ بنكه ده دوزیه وه (٣٨/١٨)، جیگای خوی زور قایم و چه سپاندبوو ، به رده وامیش كه شتی شه شه م . (الاسطول السادس) له ده ریای سپی جیگیر بوو ، سه باره ت به مه ترسی دووه م توركه كان دوای قه یرانی قوبرس له سالی ١٩٦٤و گه شه سه ندنی كیشه ی كورد له ناوخوی ولات و به ته واوه تی بیروكه ی به هیزكردنی سوپای توركیایان له ده ره وه ی ویست و ئیراده ی ئه مریكا له لایه ن توركه كانه وه ، گه لاله بوو، ئه م ئاره زووه ی توركه كانیش بو خوپرچه ك كردن به ته واوه تی له دوای داگیركردنی قوبرس له لایه ن سوپای توركیاوه له (٢٤ ته موزی ١٩٧٤) به رجه سته بوو ، كاتی ئه مریكا به مه به ستی پاشه كشه به هیزه كانی تورك له و دوورگه یه ، بو ماوه ی چوار سال (١٩٧٤ ــ ١٩٧٨ ) ناردنی چه ك و جبه خانه ی جه نگی له توركه كان بری ، توركیا كه وته هه لبه زه كردن بو دابین كردنی چه ك ، ئه وه بوو له وكاته وه توركیا بو خوپرچه ك كردن رووی له بازاره كانی ئه لمانیاو هوله نداو فه ره نساو ولاتانی ئه ورووپی كرد .

له و كاته وه چه كی ئه ورووپیه كان ، به تایبه تی ئه لمانه كان كه وته خزمه تی سوپای توركی ، جا بویه لیره دا به پیویستی ده زانین ، هه ندیك ئاماری توانای سه ربازی توركی ، له پیودانگه ی كیشه ناوخویی یه كانی توركیا ، وه ك كیشه ی كوردو ، كیشه ی ئیقلیمی یه كانی توركیا ، له گه ل یونان به تایبه تی و ولاتانی عیراق و ئیران و سوریاو بلغار و دواتر روسیای دوای جه نگی سارد، به گشتی له گه ل چه ند سه رنج و لیكدانه وه یه ك بخه ینه به رچاو، هه روه ها ره وتی به میلیتاری كردنی ده وله تی توركیاش ، له رووی قه باره و ژماره ی سه ربازی و هیزه تایبه تی یه كانی

تری ده وله ت و هێزه کانی ناوخۆو ....هتدو جۆری چه ك و ژماره ی تانك و زریپۆش و توپه کان و هێزی ده ریایی و ئاسمانی بخه ینه به رچاو.

به پێ ی ئه و ئامارانه ی له سالی ١٩٧٢ هه یه ،(١١٠/٣) توانای سه ربازی تورکه کان به م شێوه یه بوو، واته دوو سال پێش داگیرکردنی قوبرس له لایه ن تورکه کانه وه له (٢٤ ته موزی ١٩٧٤).

* هێزه کانی زه مینی / نیزامی: ١٤ فرقه ی سه ربازی، که ١٢ فرقه یان پیاده بوو، ١ فرقه زریپۆش، ١ فرقه ی میکانیك. سه ربه خۆ: ٨ لیوای سه ربه خۆ، که ٣ لیوایان پیاده بوو، ٥ لیوای زریپۆش بوو، ٢ لیواش په ره شووت، کۆی هێزه کانی پیاده ٣٩٠ هه زار که س بوو.

* هێزه کانی ئاسمانی / ٣٦٠ فرۆکه ی جه نگی، کۆی سه ربازی هێزه کانی ئاسمانی ٥٠ هه زار که س بوو.

* هێزه کانی ده ریایی / له ١٠ غواصه و ٦ فرقاطه و ١٠ مدمره و ١٨ پاپۆری پاسه وانی و ٨ پاپۆری طوربید. کۆی سه ربازی ئه م هێزه ش ٣٧ هه زار سه رباز بوو.

* هێزه کانی جه ندرمه / که هێزی یارمه تیده ری سوپایه و له ژێر سه رپه رشتی سوپادایه. ژماره که ی له و ساله دا به ٧٥ هه زار جه ندرمه مه زه نده ده کرا.

* سوپای یه ده گ (الاحتیاط) / نزیکه ی ٥٠٠ هه زار سه ربازبوو. توانایٔ سه ربازی و رێــژه و ژمــاره ی ســه ربــازی ســوپــای تــورکــی لــه ســالانــی هــه شتــادا بــه م شێوه یه بوو(١١٣/٥،١١٤).

* هێــزه کــانــی زه مینــی / نیــزامــی: ١٧ فــرقــه ی ســه ربــازی، کــه بــه م شێــوه یــه دابــه ش کــرابــوو: ١٤ فــرقــه ی پیــاده، ١ فــرقــه ی تــانــك، دوو فــرقــه ی میکــانیــك. سه ربه خو:١٦ لیوای سه ربه خۆ. که ٤ لیوای تانك بوو، ٥ لیواش پیاده، ١ لیوای په ره شوت، ١ لیوای کۆماندۆ، ژماره ی تانکه کانی سوپای تورکی ٣٥٠٠ ده بابه و ١٦٠٠ناقله ی سه ربازی هه لگربوو، کۆی سه ربازی هێزه کانی زه مینی تورکی ٥٧٠ هه زار سه رباز بوو.

* هێزه کــانــی ئــاسمــانــی / ٤٠٠ فــرۆکــه ی جــه نگــی، کــۆی ســه ربــازی هێــزه کــانــی ئاسمانیش ٥١ هه زار سه رباز بوو.

هێزه کانی ده ریایی / پێك هاتبوو له ١٤ غواصه و ١٢ مدمره و ٢ فرقاطه و چه ندین پـۆل پـاپـۆری تـری جـۆراوجـۆری پـاسـه وانـی و (کـاسحـه ی ئـه لغـام) و هتـد. کـۆی سه ربازی هێزه کانی ده ریایی ٤٥ هه زار سه رباز بوو.

* هێزه کانی جه ندرمه / له سالی ١٩٧٩ گه یشته ١٢٥ هه زار جه ندرمه.

* سوپای یه ده گ (احتیاط) / نزیکه ی ٥٠٠ هه زار سه رباز بوو.، هه روه ها توانای سه ربازی و رێژه و ژماره ی سه ربازی سوپای تورکی له نێوان سالانی (١٩٩١ــ

١٩٩٢) بەم شێوەیە بوو (٧٤،٧٣/٩).

* هێزەکانی زەمینی / لە ٣٨ فرقەی سەربازی پێك هاتوە، کە بەم شێوەیە بوو ٢٣ فرقەی پیادە، ٧ فرقەی تانك، ٧ فرقەی میکانیك، ٢ فرقەی کۆماندۆ، ١ فرقەی یەرەشووت، ژمارەی تانکەکانی سوپای تورکی ٢٧٨٣ تانك و ٣٥٦٠ ناقیلەی سەربازی هەلگرو ٤١٨٧ تۆپی قورس و سووکی جۆراوجۆر، کۆی سەربازی هێزەکانی زەمینی ٤٧٠ هەزار سەرباز بوو.

* هێزەکانی ئاسمانی / لە ٦٥٠ فرۆکەی جەنگی پێك هاتبوو، کە ٥٣٠ فرۆکەی لە خزمەتدا بوو، وە ١٢٠ فرۆکەی تریش لە کۆگاکانی هێزی ئاسمانی هەلگیراوەو کاری پێ نەکراوە. هەروەها هێزی ئاسمانی تورکی ٢٧٣ هەلیکۆپتەری جەنگی هەبوو.

* هێزەکانی دەریایی/ ١٥ غواصە، ١٢ مدمرە، ٨ بارجە، ٢٢ پاپۆری جەنگی جۆراوجۆر، ٧ پاپۆری شاوی و وشکایی، کۆی سەربازی هێزەکانی دەریایی ٥٢ هەزار سەرباز بوو.

هێزەکانی جەندرمە / ١٢٠ هەزار جەندرمە.

* پارێزەری گوندەکان (حماة القری)/ لە سالی ١٩٩٠ تورکیا ٩٠ هەزار چەکداری لەم جۆرەی هەبوو(١٣/١٠).

* سوپای یەدەگ (احتیاط)/ ١،١٠٧ ملیۆنیك و سەدو حەوت هەزار سەرباز بوو، کە بەم شێوەیە بەسەر هێزەکان دابەش بووبوون، زەمینی ٩٥٠ هەزار، دەریایی ٨٤ هەزار، ئاسمانی ٧٣ هەزار(٩/٧٣،٧٤).

هەروەها بەردەوام بودجەی سوپا لە پاڵ ئەو هەموو یارمەتیە سەربازییانەی ئەمریکا و ناتۆ، ڕێژەی (٥/١)ی لە داهاتی گشتی تورکەکان داگیرکردووە.

بە چاوپێخشاندنێکی خێرا بەو ئامارانەی سەرەوە دەگەینە کۆمەلێك ڕاستی، لەوانە بەردەوام توانای سەربازی سوپای تورکی هەر ١٠ سال جارێك، بە تایبەتی دوای هەردوو کودەتایەکەی (١٩٧١، ١٩٨٠) لە گەشەسەندندابووە و لە چاکترین حالەتی داو لە کاتی ئاشتی ژمارەی سەربازەکانی سوپای تورکی بە یەدەگ و ئەوانەی لە خزمەتدان خۆی لە ملیۆنێك سەرباز داوە. واتە هەر لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانی یەوە. کە ژمارەی سوپای تورکی ١ ملیۆن سەرباز بوو، تائێستا بە هەمان ژمارەو قەبارە ماوەتەوەو بەلکو ئەم ڕێژەیە لە دوای سالانی (١٩٩١ــ ١٩٩٢) زۆر زیادی کردوەو لە ملیۆنێك زیاتر تێپەر دەکات، دەگاتە (١،٦٨٩،٢٠٠) سەرباز بە هەردوو شێوەکەیەوە، هەروەها ئەگەر بێت و سەیری ژمارەی سوپای چەکداری تورکی بکەین لە نێوان سالانی (١٩٨٠ــ ١٩٩١) بۆمان دەردەکەوێت، کە ژمارەی سوپای چەکداری تورکی لە سالی ١٩٨٠ خۆی لە ٦٤٦ هەزار سەرباز

ده دات، که چی له سالانی (١٩٩١ــ ١٩٩٢) ئه و ژماره یه که متر ده بێته وه بو ٥٧٩ هه زار سه رباز

هۆکاری ئه م زیادبوونه وه ی رێژه ی سوپای چه کداری تورکی ده گه رێته وه بۆ ئه و گۆرانکارییه ئیقلیمیانه ی که له ناوچه که دا رویداوه. وه ك رووخانی رژێمی شای ئێران و هاتنه سه رکاری ئیمام خومه ینی، له ده ستدانی گه وره ترین بنکه ی سه ربازی ئه مریکی به هۆی روخانی شا له ئێران و جه نگی ٨ ساله ی نیوان عیراق و ئێران و گه شه سه ندنی بزوتنه وه ی رزگاریخوازی گه لی کورد له باشووری رۆژهه لاتی تورکیادا، بۆ سه لماندنی ئه و راستیه ش جه نگی عیراق و ئێران و کوده تای ١٢ ئه یلولی ١٩٨٠ تورکیا، هه ردووکیان له یه ك مانگدا روویدا، بۆیه سه یر نی یه حوکمی جه نرال (کنعان ئیڤرن)ی کوده تاچیه که ی ١٢ ی ئه یلولی ١٩٨٠ تا سالی ١٩٨٩ به رده وام بێ.

ئه وه بوودوای ٤ مانگ له کۆتایی هاتنی جه نگی نێوان عیراق و ئیران، (کنعان ئیڤرن) وازی له ده سه لات هێنا، و تورگت ئۆزال له شوێنی دانرا، واته دووباره ده سه لات درایه وه به مه ده نیه کانی تورك، هه روه ها ئه گه ر بێت و جیاوازییه ك له نێوان ژماره ی یه که کانی کۆماندۆی تورکی و ژماره ی (ناقیله ی سه ربازی هه لگر)و ژماری پۆلیسی جه ندرمه ی نێوان سالانی ١٩٨٠ و (١٩٩١ــ ١٩٩٢) بکه ین، ئه م یه که سه ربازیانه زۆر زیادیان کردوه، بۆ نمونه له سالانی هه شتا یه که سه ربازییه کانی کۆماندۆ خۆی له (١ تا ٢) لیوا تێپه ری نه ده کرد، که چی له سالانی (١٩٩١ــ ١٩٩٢) گه یشته ٢ فرقه ی کوماندو، هه روه ها رێژه ی (ناقله ی سه ربازی هه لگر) له سالانی ١٩٨٠ خۆی له ١٦٠٠ ناقله ده دا، که چی له سالانی ٩٠ گه یشته ٣٥٦٠ ناقله ی سه ربازی هه لگر، هه روه ها ئه گه ر بێت و سه یری ژماره ی جه ندرمه بکه ین له سالانی ١٩٧٩ خۆی له ١٢٥ هه زار جه ندرمه ده دا، که چی له سالانی ٩٠ ئه م رێژه یه که م کرایه وه بۆ ٢٠١ هه زار جه ندرمه. هۆی ئه م که م بوونه وه یه ش ده گه رێته وه بۆ سه بۆ سه رهه لدانی هێزێکی تر له ناوچه کوردنیشنه کان به تایبه تی له لادییه کان، ئه ویش (پاسه وانی لادێ یه کانه) که پێشتر لادێیه کان له ژێر کۆنترۆلی جه ندرمه کان دابوون، هۆی زیاد بوونی رێژه ی ئه م یه که سه ربازییانه ش ده گه رێته وه بۆ گه شه سه ندنی بزوتنه وه ی چه کداری پارتیزانی له ناوچه کوردنشینه کان، ئه م یه که سه ربازی و جۆره چه کانه ش، بێ شك ده وری کاریگه ریان هه یه له شه ری دژ به پارتیزانی، جا بۆ سه لماندنی ئه و راستیه له ئامارێکی (حلفی ناتۆ)، که رێژه و توانای سه ربازی ولاتانی سه ربه (ناتۆ)ی له نێوان سالانی (١٩٩١ــ ١٩٩٢) له گۆڤاری THE NAYLITARY BALANCE- 1991-1992 ده ست نیشان کردوه، له و ئاماره دا ته نیا ژماره ی ئه و تانك و ناقله و ئه و چه کانه ی له و

ناوچانەدا دەست نیشان کردوە، کە (حوکمی عورفیان لێ بەرقەرار نی یە ـ نووسەر) واتە ئاماژەی بۆ ژمارەو جۆری ئەو چەکانە نەکردووە کەکەوتونەتە باشووری رۆژهەلاتی ولاتی تورکیا و سەر سنورەکانی عیراق و سوریاو ئیران، کەدەلێن ژمارەی ناقیلە سەربازە هەلگرەکانی تورکی (١٣٩٠) ناقیلەیەو هەروەها تورکیا خاوەنی ٢٨٠٠ تانکە(٢٣٣/٩)، هەروەك لە پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد کەژمارەی ناقیلەکانی تورکی لەسالانی (١٩٩١ـ ١٩٩٢) ٢٥٦٠ ناقیلەیەو هەروەها ژمارەی تانکەکانی تورکیش لەهەمان سالدا ٣٧٨٣ تانکە، واتە دوای لیك دەرکردنی ئەو ژمارانە، بۆمان دەردەکەوێت کە ٢١٧٠ ناقیلەی سەربازهەلگرو ٩٨٣ تانك لەناوچە کوردنشینەکانی باشووری رۆژهەلات بلاوەی پێ کراوە، جگە لەوە لەکۆی ٤٧٠ هەزارسەربازی هێزی زەمینی، ئێستا کۆی ئەو هێزەی سەرگەرمی ئەو شەرەن لەگەل PKK دا، بەهێزی سوپاو جەندرمەوە خۆی لە ٢٠٠ هەزار سەربازو جەندرمە دەدات(١١/١٩) . هەروەها ئەگەر بێت و ژمارەی (پاسەوانی گوندەکانیشی) بخەینە سەر کە لەسالی ١٩٩٠ (٩٠)هەزار پاسەوان بوو، بێ شك ئێستا ئەو رێژەیە زیادی کردووە، ئەوا نزیکەی ٣٠٠ هەزار چەکدارو سەربازی تورکی سەرگەرمی جەنگی دژ بەکوردەکانن، کەدەکاتە (٣/١)ی سوپای تورکی بەگشتی جگە لەمە ئەگەر بێت و سەیری رادەو توانای سەربازی هێزەکانی دەریایی تورکی لەسالانی (١٩٩١ـ ١٩٩٢) بکەین، سەیر دەکەین رێژەو توانای ئەو هێزەش لەچاو سالانی ٨٠ بەشێوەیەکی سەرنج راکێشەو زیادی کردووە، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەو ئالۆزییە بەردەوامەی نێوان یۆنان و تورکیا، لەسەر دیاریکردنی سنووری ئاوی ئیقلیمی و کێشەی قوبرس، یۆنانەکان بەپێ ی یاسای (قانون البحار) دەیانەوێت سنووری ئاوی ئیقلیمی خۆیان بۆ (١٢) میل درێژ بکەنەوە، کەچی تورکەکانیش پێ لەسەر ٦ میل دادەگرن، بۆیە زۆربەی چاودێرانی سیاسی دەلێن، ئەگەر بێت و ئەم کێشەیە چارەسەر نەکرێ، تورکیا بەرامبەر بەو ئارەزوانەی یونان دەستەوەستان ناوەستێ ، ئەگەری روودانی جەنگ لەنێوان ئەو دوو ولاتە لەئارادا دەبێت، بەلام کاتێك یەکێتی ئەورووپا، بریاری وەرگرتنی تورکەکان بدات لەیەکێتی گومرگی ئەورووپا و گوێ بەمەرجەکانی یۆنان نەدات، کەبەردەوام یۆنانەکان بەحوکمی ئەوەی ئەندامی کاراو هەمیشەیی ئەو یەکێتیەن، وەرگرتنی تورکیای بە ٣ مەرج بەستۆتەوە، ئەویش رێگەدان بەیۆنانیە قوبرسیەکان بۆ هاتنەناو بازاری هاوبەشی ئەورووپی و چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەتورکیاو رێگەدان بەیۆنانیەکان بۆ درێژکردنەوەی سنووری ئاوی ئیقلیمی خۆیان بۆ ١٢ میل، دەبێتە مایەی ئەوەی کەجەنگێکی مالکاولکارنە لەنێوان تورکەکان و یونانیەکان رونەدات، بەلام وادیارە

ئەورووپاش درکی بەو مەترسیە کردبێ، بۆیە وەزیرانی دەرەوەی یەکێتی ئەورووپا لە (١٣، ١٩٩٥/٦/١٤) لە کۆبونەوەی لۆکسمبۆرگ بریاری وەرگرتنی تورکیایان لە یەکێتی گومرگی ئەورووپا لە سالی ١٩٩٦ (١/١٢) پەسند کرد. بەم شێوەیەش یەکێتی ئەورووپا ئەو کارتەی لە دەست یۆنانەکان دەرهێناو، مەسەلەی جەنگێکی ئیقلیمی لە نێوان ئەو دوولایەنەی خامۆش کردەوە. هەر بۆیەشە یۆنان لە هەمان مانگدا کارتی توندوتۆل کردنی پەیوەندییەکانی لەگەل (PKK) دژی تورکیا خستۆتەگەر.

هەروەها دامەزراندنی هەزاران بنکەی موشەکی و توپخانەی قورس لەسەر سنوری ناوچەکانی قەفقاسیا و بەلتیق لەلایەن روسەکانەوە. تورکیاش مەترسی خۆی لە بلاوبوونەوەی ئەو چەکانە خستۆتە روو، داوای لە رووسەکان کردووە، کە پابەندی رێکەوتنامەی سالی (١٩٩٠) بێت بۆ کەمکردنەوەی چەکی تەقلیدی لە ئەورووپا، ئەو رێکەوتنەش لەلایەن (٣٨) ولاتەوە مۆرکراوەو تورکیاو روسیا و ئەمریکاش ئەو رێکەوتنەیان ئیمزا کردووە. بەلام رووسەکان بە ئاشکرا رایانگەیاندوە کە ئەوان پابەندی ئەو رێکەوتنامەیە نابن. کاتێکیش مەترسی تورکەکان زیاتر بوو. کاتێ ئەمریکا و بەریتانیا هیچ نارەزاییەکی خۆیان بەرامبەر بەو راگەیاندنەی رووسەکان دەرنەبری. هەروەها تورکیا بە هۆی بنیاتنانی پرۆژەی (گاپ) لەسەر هەردووو روباری فورات و دجلە، کە دەیەوێت لە رێگای ئەو پرۆژەیەوە باری ئابووری ولات و توانای وزەی کارەبایی و زیاد کردنی سامانی کشتوکالی خۆی پەرەپێبدات، کێشەیەکی زۆر گەورەی لەگەل ولاتانی سوریا و عیراق بۆ ناوەتەوە و بۆتە سەرچاوەی ئالۆزی پەیوەندی نێوان ئەو سێ ولاتەو مەترسی رووبەروو بوونەوەی عەسکەریشی هێناوەتە ئاراوە. جا تورکیاش دەیەوێت لە رێگای سوپایەکی بەهێزو ئامادە وا لەو دوو ولاتە بگەیەنێت، کە نەتوانن بەشێوەی سەربازیانە دژی جێ بەجێ کردنی ئەو پرۆژە چارەنووسسازەی تورکیا بوەستن. بۆیە تا ئەو مەترسیانە لە ئارادابێ، دەسەلاتی عەسکەرەکان و قەبارەو ژمارەی سوپای تورکی رۆژ لە دوای رۆژ لەگەشەسەندندا دەبێت. بەلام ئەگەری چوونە نێو یەکێتی ئەورووپا، لەوانەیە ببێتە مایەی لەدایک بوونی تورکیایەکی ئەوتۆی بێ کێشە، لەسەر ئاستی ناوخۆیی و ئیقلیمی.

## تاکەی دەسەلاتی سیاسیانەی عەسکەر لە تورکیا بەردەوام دەبێت؟!

جگە لە کێشە دەرەکیەکانی تورکیا، تا ئێستا ئەو کێشە ناوخۆییانەی بەرۆکی تورکیایان بەرنەداوەو هەرەشە لە ئاسایشی ناوخۆی تورکیا دەکەن، خۆی لە (٢) کێشەی زۆر زەق و بەرچاودا دەدۆزێتەوە.

١ ــ مه سه له ی جیابوونه وه ی کورده کان .
٢ــ په ره سه ندنی نفوزی سیاسیانه ی ئایین .

جگه له مه خراپ بوونی باری ئابووری تورکیا و زیادبوونی رێژه ی قه رزه کانی سه ر تورکیا و نزم بوونه وه ی نرخی لیره و کورت هێنانی بودجه ی ده وڵه ت و نه بوونی دیموکراسی و جێگیرنه بوونی باری سیاسی ناوخۆی تورکیا ، به هه مان شێوه هه ره شه له ئاسایشی ناوخۆی تورکیا ده که ن ، به لام ئه م کێشانه ده رئه نجامی ئه و دوو کێشه ی سه ره وه ن ، زیاتر له وه ی که کێشه ی سه ربه خۆبن .

شێوازی چاره سه رکردنی ئه و کێشانه ش ، خۆی له دوو بۆچوونی جیاوازدا به دی ده کات بۆچوونی عه سکه ره کان و بۆچوونی سیاسیه کان ، تاقمی دووه م خۆی له دوو باڵدا ده خاته روو . باڵی یه که میان حزب و گروپه سیاسیه چه پ و دیموکراتخوازه کان و که سایه تیه سیاسی و رۆشنبیره کان ده گرێته خۆ ، که پارته کانی (گه ل و سوسیال دیموکراتی گه ل و دیموکراتی نوێ و کرێکاران و که سایه تیه سیاسی و رۆشنبیره کان ده گرێته وه) . ئه م باله چاره سه ری سه رجه م کێشه ناوخۆییه کانی تورکیا له جێ به جێ کردنی ته واوی پرنسیپه کانی دیموکراسی به دی ده کات . باڵی دووه میش له حزبه موحافزکاره کان و ئوسولیه کان و نه ته وه په رسته کان پێك دێت که پارته کانی (رێگای راست و نیشتمانی دایك و چه پی دیموکرات و ره فاه و بزوتنه وه ی نه ته وه یی ده گرێته وه) هه ر یه ك له پارته کانی ئه م باله به شێوه یه کی جیا له یه ك ده روانن دیموکراسی ، بۆ نموونه ئوسولیه کان دیموکراتیان تا ئه و راده یه ده وێ ، که بزووتنه وه ی ئوسولی تیا گه شه ده کات ، له وه زیاتر دژی ده وه ستن . نه ته وه په رسته کان دیموکراتی ته نیا به نه ته وه ی تورکی ره وا ده بینن . پارتی رێگای راستی موحافزکاری به گشتی و سلیمان دیمریل به تایبه تی ، هه ر گۆرانکارییه ك به سه ر سیستمی سیاسی ولات دابێت به لای ئه وانه ده بێته مایه ی به رپاکردنی دیموکراسی ، ئه مه ش ده بێته هۆی زیاتر گه شه کردنی بزووتنه وه ی سیاسی کورده کان له ناو تورکیا و داموده زگاکانی ، ئه وه ش به هه ره شه یه کی جدی ده زانن له سه ر ئاسایشی نه ته وه ی تورك ، ئه م هه لۆیسته ش له هه لوێستی سوپاوه سه رچاوه ی گرتووه . به لام ئه مه ش مانای وانیه که باڵی دووه م دژی دیموکراسی بن ، چونکه خودی ئۆزال سه رۆکی پارتی نیشتمانی دایك و چیله ری سه رۆکی پارتی رێگای راست ، چاره سه ری کێشه کانی تورکیایان له زیاتر پیاده کردنی دیموکراسی له ولاتدا به رجه سته ده کرد . هه رچه نده ئۆزال گیانی خۆی له سه ر ئه و بۆچوونه دانا ، چیله ریش له سه ره تای ده سه لات وه رگرتندا به لێنی زیاتر هێنانه دی دیموکراسی دا ، به لام

ئه‌ویش دواتر له‌و به‌لێنانه‌ی پاشگه‌ز بووه‌و چووه‌ پال دیمیرل و سوپا .

واته‌ مه‌سه‌له‌ی پیاده‌کردنی دیموکراتیه‌ت ، ئه‌گه‌ر به‌ ته‌واوه‌تیش نه‌خه‌ملێنرابێ ، به‌لام به‌ ده‌رمانی چاره‌سه‌ری کێشه‌کانی ناوخۆی تورکیا داده‌نرێت . به‌مه‌ش بۆمان ده‌رده‌که‌وێت که‌ باڵی دووه‌می تاقمی سیاسیه‌کان ، له‌سه‌ر شێوازێکی هاوچه‌رخانه‌ی دیموکراسی کۆك نین و هه‌ریه‌که‌یان جۆره‌ شێوازێکی دیموکراسیانه‌ بۆ چاره‌سه‌ری کێشه‌کانی ناوخۆی تورکیا به‌ باش ده‌زانن و په‌یره‌وی ده‌که‌ن . به‌لام تا راده‌یه‌ك ده‌توانین بلێین هه‌ردوو باله‌که‌ ، له‌ خاڵێکدا یه‌کتر ده‌گرنه‌وه‌ ، ئه‌ویش به‌رپاکردنی دیموکراسیه‌ ، ئه‌مه‌ له‌ لایه‌ك ، له‌ لایه‌کی تر ئه‌گه‌ر حزبه‌ موحافزکاره‌کان دژی دیموکراسی بن ، به‌لام له‌به‌ر خێرو خۆشی به‌روبوومی به‌ ئه‌ندام بوونیان له‌ یه‌کێتی ئه‌وروپا ، ناچارن حه‌ز به‌ چاره‌ی دیموکراسی بکه‌ن ، چونکه‌ ئه‌وروپا مه‌رجی وه‌رگرتنی تورکه‌کانیان له‌و یه‌کێتی یه‌ به‌ستۆته‌وه‌ به‌ زیاتر پیاده‌کردنی دیموکراسیه‌ت و رێزگرتن له‌ مافی مرۆڤ له‌ تورکیا . هه‌رچی سوپاشه‌ چاره‌سه‌ری ئه‌و کێشانه‌ له‌ چوارچێوه‌ی پرنسیپه‌کانی ئه‌تاتورکدا به‌دی ده‌کات . وه‌ تا ئێستاش له‌ تورکیا شێوازی چاره‌سه‌ری عه‌سکه‌ریانه‌ بۆ کێشه‌ی کورده‌کان له‌ ئارادایه‌ ، هۆی زالبوونی ئه‌م بۆچوونه‌ش بۆ بێ هێزی دام و ده‌زگای ده‌ستوری ولات ده‌گه‌رێته‌وه‌ ، که‌ ناتوانێت رووبه‌رووی ئه‌و کێشانه‌ ببێته‌وه‌ . ئۆبالی ئه‌و بێ هێزیه‌ی دام و ده‌زگای ده‌ستوریش ده‌که‌وێته‌ ئه‌ستۆی سوپا ، چونکه‌ عه‌قلیه‌تی سیاسیانه‌ی سوپا به‌رده‌وام رێگربووه‌ له‌به‌رده‌م گه‌شه‌سه‌ندنی ئه‌و دام و ده‌زگایانه‌ ، که‌ هه‌رگیز بواری به‌ دیموکراتیزه‌کردنی ئه‌و دامو ده‌زگایانه‌و ژیانی سیاسی تورکیان له‌ رێگای ده‌ستوره‌ عه‌سکه‌رییه‌کانه‌وه‌ نه‌داوه‌ ، ئه‌مه‌شیان بۆ (٣) فاکته‌ر ده‌گه‌رێته‌وه‌. فاکته‌ری (١، ٣) تا ئێستا کاری پێ ده‌کرێ ، به‌لام فاکته‌ری (٢) له‌ دوای کۆتایی هاتنی جه‌نگی ساردو له‌ دایك بوونی سیسته‌می نوێی جیهان ئه‌و کاریگه‌رییه‌ی جارانی نه‌ماوه‌ .

١ ــ زال بوونی بیرورای راست ره‌وانه‌و نه‌ته‌وه‌ په‌رستانه‌و فاشیانه‌ به‌سه‌ر سوپادا ، که‌ ئه‌مانه‌ش خۆیان له‌ پرنسیپه‌کانی ئه‌تاتۆرکدا ده‌دۆزنه‌وه‌ .

٢ ــ هه‌وڵدانی تورکیا بۆ پاراستنی لای باشووری په‌یمانی ناتۆ له‌ جه‌نگی ساردا . چونکه‌ هه‌ر شلۆقیه‌ك له‌ ناو تورکیا ، ده‌بووه‌ مایه‌ی لاسه‌نگ کردنی جه‌نگی سارد له‌ نێوان هه‌ردوو که‌مپی دژ به‌یه‌ك له‌ ناوچه‌که‌دا .

٣ ــ ده‌سه‌لاتی مێژوویانه‌ی عه‌قلیه‌تی عه‌سکه‌رییه‌کان به‌سه‌ر سیاسیه‌کانی تورك . که‌ ره‌گ و ریشه‌که‌ی بۆ هه‌لکه‌وته‌ی میلیتاریانه‌ی ئیمپراتۆریه‌تی عوسمانی ده‌گه‌رێته‌وه‌ .

بەلام لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکاریە نوێیانەی ئەمڕۆ بەسەر سیستەمی کۆنی جیهاندا هات، بووە مایەی نەمانی جەنگی ساردو نەمانی رۆڵی (حلفە سەربازیەکان) بۆ پاراستنی پارسەنگی هێزەکان لە نێوان هەردوو بەرەی رۆژهەلات و رۆژ ئاوا لەکاتی جەنگی ساردا. هەروەها بووە مایەی لەدایکبوونی سیستەمێکی نوێی جیهانی، لەسەر بنەماکانی (دیموکراتی ــ مافی مرۆڤ ــ بازاری ئازاد) واتە والاکردنەوەی دەرگا لەسەر گشت ئەو مەسەلانەی کە لە ماوەی (٧٠) سالدا باسکردنیان بقە بوو، وەك مافی نەتەوە ژێردەستەکان و سانسۆری ئایدۆلۆجی و هتد. ئەمەشیان گۆرزێکی کوشندە بوو، لە یەکێك لەو هۆکارانەی کە پێشتر سوپای تورکی بۆ مامەلەکردن لەگەل ژیانی سیاسی تورکیا دەستی پێوەگرتبوو. هەروەها ئەمرۆ زۆربەی سیاسیەکانی تورك گەیشتونەتە ئەو راستیە، کە بنەماکانی ئەتاتورك بەو شێوەو جۆرەی دارێژراون، بەبەربەستێکی سەرەکی و هەمیشەیی دادەنرێت بۆ گەشەنەکردنی باری سیاسی ئەمڕۆی تورکەکان، بۆیە سەیر نی یە سیاسیەکانی تورك بکەونە خۆ بۆ هەلوەشاندنەوەو دارمانی ئەو بنەمایانە. سەرۆك ئۆزال لە ماوەی حوکمرانی خۆیدا، دانی بە بوونی نەتەوەی کوردناو، بەدووەم نەتەوەی سەرەکی تورکیای دانا. تانسو چیلەریش لەم ماوەیەدا. لە بەردەم پەرلەمانی ئەوروپی دانی بە بوونی (١٠) ملیۆن کورد لە تورکیا نا، ئایا ئەم هەلوێستانە سەرپێچی کردن نی یە لە بنەمای(قەومیەتی) ئەتاتورك ؟! هەروەها تانسوچیلەریش، بۆ زیاتر کەمکردنەوەی دەسەلاتی دەولەت بەسەر ئابووری ولاتداو رێگەدان بەسەربەخۆی کردنی ئابووری تورکیا، هەموو هەولێکی خۆی و حکومەتەکەی خستۆتە گەر بۆ هەراج کردنی پرۆژەکانی دەولەت، تابتوانێ پارسەنگی کورت هێنانی بودجەی دەولەت راست بکاتەوە، ئێستا (١٠٦) پرۆژەی حوکومی لە هەراج دایە، ئەو پرۆژانەش خۆی لە کارگەکانی ئاسن و پۆلا و پرۆژەکانی بەرهەمهێنانی نەوت و کارەبا و چیمەنتۆو پلاستیك و کیمیاوی و ئۆتۆمبیل و بانکەکان دەدۆزێتەوە (٦/١٥). ئایا ئەم کارە لە گۆرنانی بنەمای (دەولەتیەتی) ئەتاتورك ناگەیەنێ ؟! جگە لەوەکاتێ ئوسولیەکانی تورکیا توانیان لە هەلبژاردنەکانی شارەوانی (٢٧ ئازاری ١٩٩٣) رێژەیەکی باش بەدەست بهێنن و سەرۆکایەتی دوو شارەوانی گەورەی وەك ئەستامبوّل و ئەنقەرە بگرنە دەست. بەگەورەترین زەبری کوشندە دادەنرێت، کە ئاراستەی بنەمای (علمانیەت) کرابێ، هەرچەندە ئەم تاقمە لە سالانی (٦٠)وە کاری سیاسی دەکەن بەلام هیچ کاتێك بەو شێوەیە دەسەلات و نفوزیان لە نێو تورکیادا زیاد نەکردوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، ئەمرۆ ئەو (٦) بنەمایانەی ئەتاتورك، کە سوپا هەولی پاراستن و مانەوەی دەدات، هیچ کامێکیان بەکەلکی ئەمرۆی ژیانی سیاسی و

ئابووری و کۆمەلایەتی تورکەکان نایەت. لە هەمان کاتیشدا ئەوە دەگەیەنی، کە سوپا لە بەرامبەر هەندێ کێشەی ناوخۆدا لە تنازل دایەو، لە هەندێکی تریشدا لەگەل سیاسیەکان لە ململانێ دایە، بەتایبەتی مەسەلەی زیاتر بە دیموکراتیزەکردنی تورکیا. ئەم مەسەلەیەش راستەوخۆ بە چارەسەرکردنی سیاسیانەی کێشەی کورد گرێدراوە. هەربۆیە ئەمرۆ سوپا بە حوکمی ئەو گۆرانکاریانە، خۆی لە بەردەم دوو گوشاری سەرەکی دا دەدۆزێتەوە. یەکەمیان گوشاری ناوەوە، دووەمیان گوشاری دەرەوە کە لە لایەن ئەوروپیەکان و ئەمریکاییەکانەوە کاری بۆ دەکرێ. هەردووبەرەکەش زەمینەی بە دیموکراتی کردنی تورکیا، لە چارەسەرکردنی سیاسیانەی کێشەی کورددا بەدی دەکەن، تا کێشەی کورد لە تورکیا چارەسەر نەکرێ دیموکراتیزەکردنی ژیانی سیاسی بەکارێکی مەحال دەزانرێ. کەچی سوپا چارەسەری سیاسیانەی کێشەی کورد بە مەترسیەکی گەورە دەزانێ بۆ سەرقەوارەی سیاسی ئەمرۆی تورکیا و بنەمای (قەومیەتی) ئەتاتورک، بەلام یەکلانەبوونەی تا ئێستای کێشەی کورد لە تورکیا و پێ داگرتنی سوپا بۆ دژایەتی کردنی دان نان بە مافی نەتەوەی کورد لە تورکیا، دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە هێشتا هەندێ تاقمی سیاسی شۆڤینی و ئوسولی و پارتی موحافزکارو برجوازی راست رەوی تورك، لە ژێر پەردەوە وەك هاندەرێك بۆ سوپا، دژی چارەسەری سیاسیانەی کێشەی کوردن لە تورکیا، بۆ نموونە لابردنی یاسای قەلاچۆکردنی تیرۆریزم بە تایبەتی مادە (٨). دەرگای دیالۆگی سیاسی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد دەخاتە سەرپشت، کەچی زۆربەی حزبە موحافزکارو ئووسلی ونەتەوە پەرستەکان دژی ئەو دەستکاریە وەستان، بۆ ئەوەی کێشەی کورد چارەسەر نەکرێ. لە کۆتایی سالی رابردوو پارتی گەلی سوسیال دیموکرات، لە بەرامبەر پەسەندکردنی پرۆژەیەکی DEP حزبەکەی چیلەر بۆ فرۆشتنی دامودەزگاو کارگەکانی حکومەت. داوای لابردنی یاسای قەلاچۆکردنی تیرۆریزمی کرد بە هەنگاوێکی گرنگی دادەنا بۆ زیاتر بە دیموکراتیزەکردنی ولات. بەلام حزبە سیاسیە موحافزکارەکان و حزبی رەفاو حزبی تورك پەرستی (ئەلب ئەرسەلان) و حزبە راست رەوەکان لە پەرلەمانی تورکی، بە توندی دژی دەستکاری کردنی ئەو یاسایە راوەستان، بە بیانووی ئەوەی کە یاسای نوێ دەبێتە مایەی تەسکردنەوەی (مەفهومی) تیرۆرو تەسك کردنەوەی بازنەی شێوەکانی تیرۆر ئەمەش گوایە دەبێتە هاندەرێك بۆ پەرە پێدان بە (نزعەی) جوداخوازی و ئازادی بیرورا. بەلام حزبی گەلی سوسیال دیموکرات، هەرەشەی دەست لە کارکێشانەوەی لە حکومەت خستە بەردەم چیلەر ئەگەر بێت و ئەو یاسایە لانەبرێت (٤/١٢). هەربۆیە ئەمرۆ (٣٠٪) سوپای تورکی سەرگەرمی جەنگێکی بێ هودەیە لە دژی کوردەکان و

نزیکه ی (٣٠٠) هه زار سه ربازو جه ندرمه و پاسه وانی گونده کان و سه دان فرۆکه و زرێپۆش و ماشێنی جه نگی بۆ خراوه ته گه ر. سالانه ش ئه م جه نگه سه دان ملیون دۆلار له بودجه ی ده وله ت داده وشێ. هه ر بۆیه ئه م جه نگه به هۆکارێکی سه ره کی داده نرێ بۆ داته پینی باری ئابووری ولات و کورت هێنانی بودجه ی ده وله ت و که له که بوونی قه رزه کانی سه ر تورکیا که له (٣) مانگی یه که می ئه مسالدا خۆی له (٧١,٦) ملیار دۆلار ده دا. هه روه ك تانسۆ چێله ر له لێدوانێکیدا له به رامبه ر سوپای تورکی له دیاربکر، به بۆنه ی جه ژنی سه ری سالی نوێ ی (١٩٩٤) رایگه یاند، ئه م جه نگه ی دژ به کورده کان له ماوه ی (١٠) سالی رابردوودا (٥٥) ملیار دۆلاری ده وله تی هه للوشیوه (٦/١٦) که چی کۆی قه رزه کانی سه ر تورکیا له کۆتایی سالی ١٩٤٤ خۆی له (٦٥,٦) ملیار دۆلار ده دا. واته ئه گه ر سوپا ئه و شه ره ی دژ به کورده کان به رپا نه کردبایه ئێستا باری ئابووری تورکیا به ره و ئاقارێکی باشتر ده رۆیی، چونکه زیادبوونی راده ی قه رزه کانی سه ر تورکیا، بۆ زیادبوونی قازانجی ئه و قه رزانه ده گه رێته وه، بۆ نموونه قه رزه کانی سه ر تورکیا له کۆتایی سالی (١٩٩٤) خۆی له (٦٥,٦) ملیار دۆلار ده دا که چی له ماوه ی (٣) مانگی یه که می سالی ١٩٩٥ گه یشته (٧١,٦) ملیار دۆلار. هه روه ك خه زێنه ی تورکی رایگه یاند، ئه م زیادبوونه بۆ قازانجی سه ر قه رزه کان ده گه رێته وه، نه ك بۆ وه رگرتنی قه رزی تر. واته له ماوه ی (٣) مانگدا تورکیا (٦) ملیار دۆلار قازانجی قه رزه درێژخایه ن و کورت خایه نه کانی هاتۆته سه ر. ئه مه ش ئه وه ده گه یه نێ ئه گه ر تورکیا ئه و (٥٥) ملیار دۆلاره ی له شه ری دژ به کورده کان سه رف نه کردبایه، ئێستا له جیاتی ئه وه ی تورکه کان قه رزار بوونایه، پاشکه وتی باشیان له دراوی بیانی لاکه له که ده بوو. جگه له وه به هۆی پێشێل نه کردنی مافی مرۆڤ و خراپ نه بوونی باری ئابووری ئێستا تورکیا زۆر به سانایی ئه ندامیه تی خۆی له یه کێتی ئه وروپا مسۆگه ر کردبوو، دیموکراتیزه کردنی ولاتیش به ره و ئاقارێکی سه قامگیر تر و گه شه کردووتر ده رۆیشت، جا له م پێوه ندانه وه سیاسیه کانی تورك له رێگای حزبه سیاسیه کانه وه گوشاری زۆر تر ده خه نه سه ر سوپا، بۆ چاره سه رکردنی کێشه ی کورد له تورکیا، چونکه کێشه ی کورد به کلیلی دیموکراتی تورکیا داده نێن، هه ر بۆیه ئێستا زۆربه ی حزبه چه پ ولیبرال و بورجوازییه گێردراوه کان به سه رمایه ی بیانی و گروپه رۆشنبیره کانی تورك، پێ له سه ر شێوه یه ك له شێوه کانی چاره سه ری سیاسیانه ی کێشه ی کورد داده گرن.

ئێستا ئه و حزبانه چاره سه ری کێشه ی کوردی تورکیایان خستۆته به رنامه ی

کاری خۆیانەوە هەر بۆ نموونە کاتێ (جیم بویتر) لە کۆتایی سالی ١٩٩٤ پارتی دیموکراتی نوێ ی راگەیاند، پێ ی لەسەر چارەسەری دیموکراتیانەی کێشەی کورد بە شێوازی (ئیداراتی لامەرکەزی) لە ناوچە کوردنشینەکان داگرت. ئەمەیان سەبارەت بە گوشارەکانی ناوخۆ بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە تورکیا. سەبارەت بە گوشارەکانی ئەوروپا و ئەمریکاش، واتە گوشارەکانی دەرەوە، بە هەمان شێوە داوا لە حکومەتی تورکیا دەکەن، کە دەبێت دەسکاری دەستووری تورکی بکرێت. بەتایبەتی ئەو برگانەی، کە رێگا لە دیموکراتی ولات دەگرن.

هەروەها ئەوروپا و ئەمریکا راستەوخۆ داوا لە تورکەکان دەکەن، کە زیاتر رێزی مافی مرۆڤ بگرن و بە شێوەیەك لە شێوە سیاسیەکان چارەسەری کێشەی کورد بکەن لە تورکیا. هەر کاتێکیش تورکەکان ملیان بۆ ئەو بۆچوونانە نەدابێ، ئەو دوولایەنە مەترسی بایکۆتی چەك و نەناردنی چەك و وەرنەگرتنی تورکەکانیان لە یەکێتی ئەوروپا خستۆتە بەردەم تورکیا. ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخا، کە ئەوروپا و ئەمریکا دەیانەوێ لە رێگای گوشاری نەناردنی چەك و جبەخانەی شەرەوە سوپای تورکیا بێ دەسەلات بکەن و ئەم گوشارانەش بێ سوود نەبوو، چونکە توانی دیالۆگی بە دیموکراتی کردنی تورکیا لە نێو تورکەکانەوە بخاتە بەرباس و لێکۆلینەوە. ئەوە بوو پەرلەمانی تورکیا لە (١٩٩٥/٧/٢٣) بە کۆی (٣٦٠) دەنگ بەرامبەر بە (٢٣) دەنگ بریاری دەستکاری کردنی (١٧) ماددەی دەستوری سالی (١٩٨٢) پەسەندکردو لابردنی مادەی (٨) ی یاسای تیرۆریزمیشی بۆ سەرەتای مانگی ئەیلولی داهاتوو دواخست. هەرچەندە ئەم دەستکاریەی دەستوور بە هیچ شێوەیەك خۆی لە قەرەی ئەو برگەو یاسایانە نادات کە پەیوەندیان بە مافە رۆشنبیری و نەتەوایەتی یەکانی کوردەوە هەیە. بەلام لابردنی ئەو مادەیە تا رادەیەك رێگا لەبەردەم دیالۆگی سیاسی لەسەر کێشەی کورد لە نێو تورکەکان دەخاتە سەر پشت و دەروازەیەکی گرنگە، کە لەمەودوا چارەسەری سیاسیانەی کێشەی کورد بخرێتە بەرباس و لێکۆلینەوە. چونکە تورکیا وامەزەندە دەکات، کاتێك گوشارەکانی ئەوروپا و ئەمریکا سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد و پاراستنی مافی مرۆڤ لەسەر تورکیا زیادی کرد. ئەو کاتەی بەپێ ی ماددە (٨) ی یاسای تیرور (٨) پەرلەمانتاری کوردی سەربە حزبی دیموکراتی، بە تۆمەتی جوداخوازی دادگایی کردو (٦) یان حوکم دران. کاتێکیش ئەو مادەیە لابرا، بێ شك ئەو چەترە یاساییەیە نامێنێت بۆ مانەوەی ئەو (٦) پەرلەمانتارە لە قەفەزی زیندانی. بۆیە دوور نی یە تورکیا

دوای رەتکردنەوەی ئەو مادەیە (٦) پەرلەمانتارە کوردەکە ئازاد بکات . بەم شێوەیەش دەتوانێ کەمێك روخساری ناشیرنی خۆی لە بەرامبەر دۆستەکانی جوان و قەشەنگ بکاتەوە. لەو ماوەیەشدا تورکیا چاوەڕێ ی کاردانەوەی ئەنجامی ئەو کارەی دەکات، ئەگەر هات و یەکێتی ئەوروپا داوای زیاتر مافی سیاسی کوردەکانی کرد دوورنی یە ئەمجارەیان تورکەکان (باری نائاسایی) لەسەر ناوچە کوردنشینەکان هەلبگرن. واتە تورکەکان بەم شێوازە دەیانەوێت بەشێوەی پێچ و پەنا کردن و مناوەرەی سیاسی هەنگاو بەهەنگاو مامەلە لەگەل کێشەی کورد بکەن و بەگوێرەی توندی و نەرمی گوشارەکانی ئەوروپا مافە سیاسی یەکانی کورد فراوانتر بکەن. ئەگەر بێت و دیسانەوە ئەوروپا داوای زیاتر دابین کردنی مافەکانی گەلی کورد بکات لە تورکیا . لەوانەیە ئەمجارەیان تورکەکان هەولی هێنانەکایەی شیوازی ئیداراتی خۆجی یەتی لە ناوچە کورد نیشینەکان بدەن. بەلام بریاری دەستکاری کردنی دەستووری عەسکەرەکان ، خۆی لەخۆیدا بەهەنگاوێکی گرنگ و پۆزەتیف دەژمێردرێ، چونکە ئەمەیان یەکەم جارە لە تورکیا سیاسی یەکان دوور لە دەسەلاتی عەسکەرەکان هەولی هێنانەدی دەستورێکی مەدەنی دەدەن و بەسەرەتایەکی باشیش دادەنرێ، بۆ زیاتر بە دیموکراسی کردنی ولات، بە رپاکردنی دیموکراسیەتیش هەنگاوێکە بۆ لەدایك بوونی شێوەیەك لە شێوەکانی چارەسەری سیاسیانەی کێشەی کورد لە تورکیا (ئۆجەلانیش) لە ناواخنی (٣٠) نامەکانیدا بۆ ولاتانی جیهان، داوای گوشاری زیاتر دەکات بۆ سەر ئەنقەرە و دەرك کردنی بەو راستیانەی سەرەوە لەو نامانەدا روون و ئاشکرایە. بۆیە دەتوانین بلێین سالی ئایندە سالێکی گرنگە لە تورکیاو چاوەڕێ ی زۆر شتی نوێ ی لێ دەکرێ سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد. کە لەمەودوا چارەسەری کێشەکانی ناوخۆی تورکیا، بەزمانی گفتوگۆو دیالۆگ چارەسەر بکرێ، نەك بە لولەی تفەنگ و زنجیری زریپۆش. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ. کە گوشارەکانی ئەمریکاو ئەوروپا وای لە حزبە موحافزکارەکان و راست رەوو نەتەوە پەرستەکان کرد. بگەنە ئەو راستیە کە چارەسەرکردنی کێشە ناوخویەکانی تورکیا لە رێگای زیاتر والاکردنەوەی ژیانی دیموکراسی یەوە دێنە دی. بۆیەش گشت ئەو حزبانە جگە لە حزبی رەفاه لە (٩٥/٧/٢٣) دەنگیان بۆ دەستکاری کردنی دەستووری سالی (١٩٨٢)دا. ئەمەش بووە مایەی لەبەر یەکترازاندنی ئەو بەرە یەکگرتووەی نێوان تاقمە سیاسیەکان و سوپا . بەتەنیا هێشتنەوەی سوپا لە گۆرەپانەکەدا.

جگه له وه ئه وروپا و ئه مریکا ، زیادبوونی نفوزی ئوسولیه کانی تورکیا . له چاره سه رکردنی کێشه ی کورد به دی ده که ن . چونکه به هۆی ئه و گوشاره توند ره وه ی تانسۆ چیله ری سه رۆك وه زیران بۆ سه ر حزبه کوردییه رێگه پێدراوه کان و نهێنیه کان ، کاردانه وه یه کی خراپی هه بووه له سه ر ئاسۆی سیاسی تورکیا له به رئه وه ی ئوسولیه کانی تورکیا له سه ر مافی کورده کان توانیان ده نگێکی زۆر بێنن له هه لبژاردنی شاره وانیه کانی (٢٧ ئازاری ١٩٩٣) له ناوچه کوردنشینه کان . له به ر ئه وه ی کورده کان و ئوسولیه کان له دوو سه نگه ری جیاوازدا خه بات بۆ هه لوه شاندنه وه ی بنه ماکانی ئه تاتورك ده که ن . هۆکاری به ده ستهێنانی رێژه یه کی زۆری ده نگی ئوسولیه کانیش له هه ردوو شاری ئه ستامبۆل و ئه نقه ره ش ده گه رێته وه بۆ دوو هۆ :-

١ - بوونی رێژه یه کی زۆری کورد له و دوو شاره دا .

٢- نزیك بوونی ئه ستامبول له ولاتانی به لقان ، که رێژه یه کی زۆر له موسلمانه ئاواره کانی تیادا ده ژین . که به هۆی ئه و زولم و زۆرییه ی ده رهه قیان ئه نجام ده درێ له ناوچه کانی به لقان روویان له ئه ستامبول و ئه نقه ره کردووه . جا بۆ هه ره س هێنان به ئوسولیه کانی تورکیا به گشتی و له م دوو شاره دا به تایبه تی چاره سه ره که ی خۆی ، له چاره سه ری کێشه ی کورد له ناوه وه ی تورکیادا له لایه ن حکومه تی تورکیادا ده دۆزێته وه ، چاره سه رکردنی کێشه ی موسلمانه کانی به لقانیش زیاتر له ئه ستۆی ئه وروپا و ئه مریکا دایه . به م شێوه یه تورکیا تا راده یه ك ده توانێت نفوزی سیاسی ئوسولیه کان له تورکیا که م بکاته وه و ئه و مه ترسیه ش دووربخاته وه .

هه روه ها ئه گه ری ئه وه ش له ئارادایه ، ئه گه ر بێت و تورکیا ئه ندامیه تی خۆی له یه کێتی ئه وروپا مسۆگه ر بکات ، ده بێته مایه ی له دایك بوونی کۆمه لێك ئه فسه ری گه نجی نوێخوازی تێکه لاو به ژیانی دیموکراسی ئه وروپای یه کگرتوو و رێزگرتوو له مافی مرۆڤ . له شوێن ئه و ئه فسه ره کۆنه ته قلیدیانه . ئه مه ش ده بێته هۆی نواندنی هه لوێستێکی نه رمتر له لایه ن سوپاوه له به رامبه ر چاره سه ری سیاسیانه ی کێشه ی کورددا . بۆیه لێره دا ده توانین ئه وه دووپات بکه ینه وه ، که له مه و دوا سوپا چیتر به و پێودانگه ی (٧٠) سالی رابردوو ، ناتوانێ ده ست له نێو کاروباری ناوخۆی ولات و ژیانی سیاسی و دامووده زگا ده ستورییه کانی وه ربدات . وه مه حالیشه جارێکی تر سوپا له تورکیا . چیتر کوده تای ره ش یا سپی به رپا بکات .

## پەراوێزەکان :ـــ

١ـ شەڕی چالدێران لە ساڵی ١٥١٤ لەگەڵ دەوڵەتی سەفەوییەکان ڕویدا، شەڕی مەرج دابقیش لە (٢٤ ئابی ١٥١٧) لەگەڵ مەمالیک لە شام ڕویداو لە ئەنجام دا وڵاتی شام کەوتە دەست عوسمانیەکان. شەڕی ریدانیەش لە (٢٢ کانونی دووەمی ١٥١٧) لە نزیک قاهیرە لەگەڵ مەمالیکەکان ڕوویداو میسر داگیرکرا. شەڕی قەلای بینون لە (٢٧ ئاياری ١٥٢٩) لەگەڵ ئیسپانیەکان لە نزیک جەزائیر ڕوویدا. ئەو قەلایە داگیرکراوە بووە سەرەتایەك بو چەسپاندنی دەسەلاتی عوسمانی یەکان لە ڕۆژئاوای عەرەبی.

٢ ـ سوپای ئینکشاریە، لە پاڵ هێزی دەرەبەگەکان (القوات الاقطاع) جوزی دووەمی سوپای عوسمانیەکان بوو. ئەم سوپایە هەندێك دەڵێن لەسەر دەستی سولتان ئورخان (١٣٢٦ ـ ١٣٥٩) دروست بووە. هەندێکی تریش دەڵێن لەسەردەمی سولتان موڕادی یەکەم (١٣٥٩ ـ ١٣٨٩) دامەزراوە. ئەم سوپایە لەو دینە مەسیحیانەی وڵاتانی بەلقان پێك هێنراوە. زیاتر بەمەبەستی ئاین دروست بووە: تا لەو ڕێگایەوە ئاینی ئیسلام لە نێو مەسیحیەکان بلاوبکاتەوە.

٣ ـ هەردوو تاقمی (عەلی شکری و رەئووف بیگ) عەلی شکری ئەفسەری ڕۆکن بوو لە هێزی دەریایی تورکەکان و لەگەڵ ئەندامانی ئەرزەرومو محمد عاکفی شاعیر، بالێکیان لە دژی ئەتاتورك لە نێو پەرلەمان پێك هێنا. ئەوە بوو عەلی شکری بە دەستی (توپال عوثمان)ی سەرۆکی پاسەوانی میللی بە فەرمانی ئەتاتورك تیرور کرا. هەروەها رەئووف بیگ، جەنەرالیکی برووتەرەی رزگاری نیشتمانی بوو و لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی پایەبەرزی وەك (کاظم قرەبەکرو عەلی فوئادو چەند ئەندامێکی تری پەرلەمان) بالێکیان لەناو پەرلەمان پێك هێناو دواتر ناویان لە خونا (پارتی کوماری پیشکەوتدو). لە ساڵی ١٩٢٥ چەندین نووسینگەیان لەناوچە کوردنشینەکان هەبوو. بەلام دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی کوردەکان و دەرکردنی (ئەحکامی عورفی) لەناوچە کوردنشینەکان. بارەگاکانی ئەو حزبە داخران و زوربەی ئەندامانیش دەستگیرکران.




**ئەنادۆڵ لە ناوەڕاستی سەدەی چواردەم.**

سەرچاوە: ــ ئەحمەد عبدالرحيم مصطفى ، لە رەچەڵەكی مێژووی عوسمانی (بیروت، ١٩٨٢)

پەل هاوێشتنی ئیمبراتۆریەتی عوسمانی تا ساڵی ١٦٤٨

سەرچاوە: ــ ئەحمەد عبدالرحیم مصطفی . لە رەچەلەکی مێژووی عوسمانی (بیروت. ١٩٨٢)

## سەرچاوەکان :ـ


١ ـ احمد. ابراهيم خليل (الدكتور). تاريخ الوطن العربي في العهد العثماني ١٥١٦ ـ ١٩١٦. جامعة الموصل ١٩٨٦.

٢ ـ النعيمي. احمد نوري. السياسة الخارجية التركية بعد الحرب العالمية الثانية. رسالة ماجستر. بغداد. دار الحريه. ١٩٧٥

٣ـ مجموعة اساتذة جامعتي الموصل والبغداد ـ تركيا المعاصرة. مركز الدراسات التركية. جامعة الموصل ـ ١٩٨٨

٤ـ النعيمي. احمد نوري (الدكتور). تركيا وحلف الشمال الاطلسي. المطبعة الوطنية. الاردن ـ ١٩٨١.

٥ ـ مديرية الامن العامة. مركز التطوير الامني ـ الجمهورية التركية الجارة الشمالية. مطبعة نفس المديرية. سنة الطبع بلا.

٦ ـ النعيمي. احمد نوري (الدكتور). الحياه السياسية في تركيا الحديثة ١٩١٩ـ ١٩٣٨. دار الحرية. بغداد ١٩٩٠.

٧ ـ قاسملو. عبدالرحمن (دكتور). کوردستان و کورد لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی و ئابووری و. بنکەی پێشەوا. مەهاباد ١٩٧٣. وەرگێرانی عبدالله حسن زادە.

٨ ـ الدكتور فاضل حسين. دكتور كاظم هاشم نعمه. التاريخ الاوروبي الحديث ١٨١٥ـ ١٩٣٩. طبعة الاولى وزارة التعليم العالي والبحث العلمي ـ بغداد. ١٩٨٢.

٩ ـ The MLITARY BALANCE _ 1991_1992 . The International for strategic stadies .

١٠ ـ قرارات الكونفرانس الوطني الثاني لحزب العمال الكردستاني (PKK) ١٩٩٠/٥/١٣. مكان طبع بلا. منشورات (PKK)

١١ ـ گۆڤاری ڕوانگەی جهان. ژمارە (١)ی ساڵی یەکەم. مەکتەبی پەیوەندییەکانی ی.ن.ك. تشرینی دووەمی ١٩٩٣.

١٢ ـ ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ. ژمارە (١٠٠٩).

١٣ ـ مجلة الحدث. عدد (١٠) السنة الاولى ـ انقرة ـ تركيا. كانون الاول ١٩٩٤.

١٤ ـ گۆڤاری ڕێبازی نوێ. ژمارە (٥)ی. ١٩٩٤.

١٥ ـ ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط) ژمارە (٥٢١٥).

١٦ ـ ڕۆژنامەی (الحياة) ژمارەکانی مانگی شوباتی ١٩٩٤.

١٧ ـ تفلجميل. حكمت (الدكتور). مسائل الثورة في العالم الثالث (الامبريالية والنموذج التركي) ترجمة ف ـ لقمان. دار الحداثة ـ بيروت ـ ١٩٨١.

١٨ ـ حسن. جرجيس (الدكتور) ـ تركيا في الاستراتيجية الامريكية بعد سقوط الشاه. طبعة الاولى مكان طبع بلا ـ ١٩٩٠.

١٩ ـ ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ. ژمارە ٩٩٥.

٢٠ ـ ڕۆژنامەی ولات ژمارە (٧١)ی حوزەیرانی ١٩٩٥ .

بابەتی دووەم

# کێشەی کورد وەک کێشەی قوبرس، ڕۆژهەلآت دەکاتە گۆڕەپانی تەڕاتێنی دیبلۆماسییەتی تورکیا

لەسەرەتای سالی ١٩٩٥ بەتایبەتی دوای شەری دووەمی کەنداو، دبلوماسیەتی دەرەوەی تورکیا وەك یاخی بوویك لەسیاسەتی سیستەمی نوی ی جیهانی بەگشتی و سیاسەتی ئەمریکاو ئەوروپا بەتایبەتی خوی دەنوینی و بەردەوام لەناوچەکەدا هەول دەدات بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی ولاتی تورکیا، لەسەرووی بەرژەوەندییەکانی ولاتانی ئەوروپاو ئەمریکا بخاتە بەرچاو. هەر بویەشە لەو پیودانگەوە بەردەوام لەلایەن ئەمریکاو ئەوروپاوە دووچاری چاو لی سوورکردنەوەو نارەزایی دەربرین دەبیت، لەم ماوەیەدا تورکیا دوای مردنی تورکوت ئوزال و دەسەلات وەرگرتنی سلیمان دیمیریل، چەندین هەولی جدیانە دراوە، بو دارشتنەوەی پەیوەندییە ئابووری و ئەمنیەکانی تورکیا لەگەل ولاتانی عەرەبی و ئیسلامیدا. بی شك ئەم گورانکارییەی لە ئاست سیاسەتی دەرەوەی تورکیادا، رەنگدانەوەی قەیرانە سیاسی و ئابوورییەکانی ناوخوی تورکیاو قەیرانە سیاسیەکانی نیوان تورکیاو ئەمریکاو ئەوروپایە، کە خویان لەگەشەسەندنی بزاڤی رزگاریخوازی گەلی کورد لەتورکیاو سەرهەلدانی کیشەی ئوسولیەکان و داخستنی لوولەنەوتی کەرکوك ـ یومورتالیك و دابەزینی بەهای نرخی لیرەو کەمکردنەوەی یارمەتیە ئابووری و سەربازییەکانی ئەمریکاو ئەوروپاو کیشەی تورکەکانی ولاتانی بەلقان و قوبرس و کومارەکانی پیشووی یەکیتی سوڤیەت و زیادبوونی گوشارەکانی ئەوروپاو ئەمریکا بو چارەسەر کردنی کیشەی کورد لەتورکیادا دەدوزنەوە. چونکە سیاسەتی دەرەوەی هەر ولاتیك، رەنگدانەوەی سیاسەتی ناوخویەتی، کە دەسەلاتداری سیاسی ئەو ولاتە لەسەر بنەماو پرنسیپەکانی ئەو بیرو بوچوونە سیاسی و ئابوورییانەی ناوەوە، نەخشەو ئاماری گونجاوو لەبار دادەریژی، بو ئەوەی بتوانی قەوارەی سیاسی خوی و ئاسایشی نەتەوەیی و نیشتمانی خوی لەهەر هیرشیکی کت و پری

ئه و دیو سنووره کانی و ئه و هیزو تاقم و گروپه ناوخوییانه ی به تیکده رو ئاژاوه چی له قه له میان ده دات بپاریزی و دابینی بکا. هه روه ها هه ولیش بدات بواره ژیارییه کانی خوی گه شه پی بدات و بیبووژینیته وه. بو ئه وه ی بتوانی خوش گوزه رانیه کی باش بو هاوولاتیانی خوی به ده ست بهینی و سه رمایه نیشتمانیه کانی خوی که له که تر بکات.

تورکیاش له و روانگه یه وه، دوای شه ری که نداوی دووه م، چه ندین ریککه وتننامه و کوبوونه وه ی گرنگی له گه ل ولاتانی ئیران و سوریا سازداوه، له لایه کی تریشه وه به رده وام هه ولی دارشتنه وه ی په یوه ندییه ئابووری و دبلوماسیه کانی خوی له گه ل رژیمی عیراق داوه. دوا هه ولیش خوی له کردنه وه ی لووله نه وتی که رکوك ـ یومورتالیك دا ده دوزیته وه. هه روه ها تانسو چیلله ری سه روك وه زیرانیش له سالی پاردا سه ردانی هه ردوو ولاتی لیبیاو ئیسرائیلی کرد. ئه م گورانکارییانه ی دبلوماسیه تی ده ره وه ی تورکیا چه ندین پرسیارو ئیکدانه وه ی له لای سیاسیه کانی ناوچه که و ده ره وه وروژاندووه !! که بوچی تورکیا وه ك یاخی بوویك له سیاسه تی ئه مریکا له ناوچه که دا خوی ده نوینی ؟!

جا بو ئه وه ی هوکاره کانی گورانی ئه و سیاسه ته ی تورکیا بخه ینه به رچاو پیویسته گورانکارییه کانی ناوچه که به سه ر بکه ینه وه. که تاراده یه ك هوکاری گورانکاری ئه و سیاسه ته ی ده ره وه ی تورکیامان لا روونترو ئاشناتر ده کات. به تایبه تی ئه گه ر بیت و سه یری ئه و په یوه ندییه نوییانه ی تورکیا بکه ین له ناوچه که دا. په یوه ندییه کان هیلیکی راستیان وه رگرتووه و سیگوشه یه کی سه یری له سیاسه تی ده ره وه ی تورکیا دارشتووه. ئه و هیله راسته ش سی ولاتی یاخی بووی له سیاسه تی ئه مریکا گرتوته خوی ئه وانیش «ئیران ـ عیراق و لیبیایه» واته سیاسه تی دوژمنه کانی ئه مروی ئه مریکای کردوته دوستی ئه مروی تورکیا !!

جا لیره دا حه ز ده که ین مه به ست و ئاماتجه کانی سیاسه تی تورکیا له دارشتنه وه ی یه که یه که ی په یوه ندییه کانی له گه ل عیراق و ئیران و سوریاو لیبیاو ئیسرائیل بخه ینه به رچاو.

هه موو لایه کمان ئاگادارین، له شه ری که نداودا بنکه ی ئه نجه رلیك له لایه ن هاوپه یمانان دژی رژیمی عیراق به کار هینرا، هه روه ها تورکیاش دانی به گشت بریاره کانی(UN) دانا بو جی به جی کردنی پروسه ی گه ماروی ئابووری له سه ر عیراق، ناراسته وخو تورکیا بووه یه کیك له ئه ندامه کانی هیزی هاوپه یمان، به لام ئه م به شدار بوونه ی تورکیا له گه رده لوولی بیابان دا، به باجیکی زور له سه ری وه ستاو گه وره ترین سه رچاوه ی نه وت و بازاریکی گه وره ی ساغ کردنه وه ی

که ل و په له به رهه مهێنراوه کانی و زه مینه یه کی له باریش بو به گه رخستنی کومپانیا پیشه سازیه کانی له ده ست تورکیادا.

ئه گه ر چاویك به په یوه ندییه ئابوورییه کانی ئه م دوو ولاته دا بخشینینه وه، ئه و راستیانه ی سه ره وه مان بو ده رده خا. عیراق روژانه له ریگای لووله نه وتی که رکوك ـ یومورتالیك ملیونیك و چه ندین هه زار به رمیل نه وتی ده نارده بازاره کانی جیهان. تورکیاش روژانه (٢٠٪)ی له و بره نه وته بو خوی گل ده دایه وه. هه روه ها تورکیا سالانه (٤) ملیون تون نه وتی له عیراق ده کری، جگه له وه له سالی (١٩٨٤)دا به های ئالوگوری بازرگانی نیوان ئه م دوو ولاته گه یشته ملیاریك و (٣٠٠) ملیون دولار، هه روه ها له هه شتاکانی ئه م سه ده یه دا چه ندین کومپانیای تورکی له عیراق دا کاریان ده کرد، نرخی ئه و «عقدانه»ی ئه م کومپانیایانه سازیان دابوو خوی له (٩٨٧) ملیون دولار ده داو زیاتر له (١٥) هه زار کریکاری تورکیشی خستبووه گه ر. سه ره رای ئه وه بوونی نزیکه ی ٢٢٠ کم سنووری هاوبه ش له نیوان هه ردوو ولاتدا، چه ندین پروتوکولی ئه منی له نیوان هه ردوولا به سترا. له وانه پروتوکولی (١٥ی تشرینی یه که می ١٩٨٤). که هه ریه که له هیزه کانی هه ردوولا بو راونان و ده ستگیرکردنی هیزو گروپ و تاقمه کوردی یه به رهه لستکاره کانی هه ردوولا، ده یانتوانی بو چه ند کیلومه تریك سنووری یه کتر ببرن، جا له په راویزی ئه م راستیانه دا، ئه مرو تورکیا به بی گویدانه بوچوونه کانی ئه مریکا سه باره ت به عیراق و بریاره کانی گه ماروی ئابووری (UN) له سه ر عیراق. هه ولی دامه زراندنه وه ی په یوه ندییه ئابوورییه کانی له گه ل عیراق ده داته وه و روژانه ده ستی په شیمانی ده گه زیته وه، چونکه به هوی یه ك سه نگه ری له گه ل ولاتانی هاوپه یمان، ده سکه وته ئابوورییه کانی زور که متر بوته وه، له وه ی که له گه ل عیراق دا به ده ستی ده هینا. ئه مه له لایه ك. له لایه کی تر تورکیا چاك ده زانی دامه زراندنه وه ی ئه م جوره په یوه ندییانه له گه ل عیراق مه حاله. به لام ته نیا راگه یاندنی ئه م جوره په یوه ندیانه به گوشاریکی کاریگه ر ده زانی بو سه ر ئه مریکاو ئه ورووپا به گشتی و ولاتانی که نداو به تایبه تی، بو ئه وه ی له و ریگایه وه یارمه تیه ئابوورییه کان له هه ردوولا داوشی، هه روه ك چون له م ماوه یه ی پیشوودا روویدا، کاتی کویت بو له کار خستنی ئه م هه ولانه ی تورکیا، ملیونیك دولاری وه ك یارمه تی پیشکه ش به تورکیا کرد.

سه باره ت به په یوه ندییه کانی نیوان تورکیاو ئیران و سووریاش، ئه م جوره په یوه ندییه زیاتر خوی له به رهه لستی کردنی بزاڤی رزگاریخوازی گه لی کورد ده نوینی. به تایبه تی دوای سه رهه لدانی کوردستانیکی فیدرال له باکووری عیراقدا. جا بو ریگاگرتن و به ربه ست دروست کردن له به رده م ئه م پروسه یه و

دوورخستنـه وه ی مـه تـرسی دروسـت بـوونـی کـوردسـتـانیکـی سـه ربـه خـوو ته شه نه کردنی بزاڤی رزگاریخوازی گه لی کورد له وناوچه که دا. تورکیاو ئیران و سوریا له سه ر ئاستی وه زیره کانی ده ره وه یان دا چه ندین کوبوونه وه ی سی قولیان سازدا، له و کوبوونه وانه دا چه ندین بریارو پلان و نه خشه داریژراوه ، به لام تائیستا هیچی وای لی ئاشکرا نه کراوه . هه روه ها به هوی بوونی ناوچه یه کی ئارام و پاراستنی کورده کانی باشووری کوردستان له لایه ن هاوپه یمانانه وه ، رژیمی عیراق په ل و ده ستی به ستراوه و ناتوانی هیچ کاریك دژی ئه و ناوچه ئارامه بکات ، بویه له ماوه ی رابردوودا هه ندی له و ولاتانه له جیاتی عیراق چه ندین جار راسته وخو به هیزه سه ربازی و توپه کانیانه وه سنووری باشووری کوردستانیان بریوه ، ناراسته وخوش هه ولیان داوه باری ئه منی کوردستان بشله ژینن ، وه ك داخستنی سنوورو ئابلوقه ی ئابووری و نانه وه ی ئاژاوه و ناثارامی له هه ریمی کوردستاندا. که دوا هه ولیشیان له شه ری ناوخودا به رجه سته ده بی ، به لام دوای ئه وه ی شه ری ناوخوش نه یتوانی پارسه نگی هیز به لای ئه و لایه نه دا بشکینیته وه ، که به رژه وه ندییه کانی ده وله تی تورکیا ده پاریزی ، هه روه ك تانسو چیلله ر له لیدوانیکیدا رایگه یاند (ئیمه ده خوازین ئه و هاوسه نگی یه بگیرینه وه که تاله بانی لاسه نگی کردبوو) . بویه تورکیا له م ماوه یه دا به بیانووی ته فرو تونا کردنی باره گاکانی گه ریلاکانی به (٣٥) هه زار سه رباز سنووری هه ریمی کوردستانی به قولایی (٤٠)کم به زاند، ئه م کرده وه سه ربازییه ی تورکیا هه مان کرده وه ی سه ربازی تورکیامان دینیته وه یاد که له (٢٠ ته موزی ١٩٧٤) به بیانووی پاراستنی (٣٠ ٪) له دانیشتوانی تورکه قوبرسیه کان، به هیزیکی (٣٠) هه زار سه ربازی به هوی په ره شووت (٣٨ ٪) خاکی کوماری دوورگه ی قوبرسیان داگیرکرد، هه رچه نده له و کاتانه دا گوشاریکی زور خرایه سه ر تورکیا بو کشانه وه ی هیزه کانی له و دوورگه یه به لام سوپای تورکیا روژ له دوای روژ جیگای خوی قایمتر کرد. به لام ئایا ئه مرو سوپای تورکیا به هه مان شیوه ده توانی بو ماوه یه کی دوورو دریژ له هه ریمی کوردستاندا بمینیته وه ؟ له وه لامدا ده لیین «نه خیر» چونکه باری سیاسی ئه مروی ناوچه که و جیهان له ژیر سایه ی سیسته می نوی ی جیهاندا زور زور جیاوازه له و کاتانه ی جه نگی سارددا ! ! به لگه ش بو ئه م راستیه ره ت کردنه وه ی کومه لگای نیوده وله تی بوو بو داگیرکردنی کویت له لایه ن سوپای عیراقه وه . له وانه یه بلیین گه ر وابی بوچی ئه مریکا ره زامه ندی خوی به رامبه ر به م سنوور به زاندنه ی سوپای تورکیا بو هه ریمی کوردستان نیشانداوه ؟! ده توانین مه به سته کانی ئه مریکا له پیکردنی ئه و گلوپه سه وزه ی بو سوپای تورکیا له م چه ند خاله دا ده ست نیشان بکه ین : ـ

* پاش ئەوەی تورکیا لەو شالاوە سەربازی یەی سەرنەکەوی، سیاسەتی (ئەمری واقیع) بەسەر تورکیا بچەسپینی، کە هەولبدات شەری ناوخوی هەریمی کوردستان چارەسەربکات و بە ناچاریش مامەلە لەگەل یەکیتی و پارتی دا بکات بو پاراستنی سنوورەکەی.

* بی هوودەکردن و خاموش کردنی دەمارگرژی سەرکردە سەربازی یەکانی تورک، بو چارەسەرکردنی کیشەی کورد بە شیوەیەکی سیاسیانە لە تورکیا، هەروەها کەم کردنەوەی نفوزی سیاسی PKK لە نیو تورکیاداو، بی هیزکردنی بالە ئوسولیەکانی نیو تورکیا.

* نەزوك کردنی هەر هەولیکی تورکەکان بو دارشتنەوەی پەیوەندیەکانیان لەگەل رژیمی عیراق و ریگاگرتنیش لە هەول و نەخشەکانی ئیران لە ناوچەکەدا.

* پیس کردنی فایل پی شیل کردنی مافی مروڤی تورکەکان لە نیو بازاری هاوبەشی ئەورووپا.

* بە ئاکام نەگەیشتنی بریارە سی قولیەکانی نیوان ئیران و تورکیاو سوریا.

* جالیرەدا بومان دەردەکەوی کە ئەم کوبوونەوانەو هاتووچویە دبلوماسیە سی قولیانەی نیوان ئەو سی ولاتەو لەشکرکیشیەکەی سوپای تورکیا، دژی نەخشەو پلانەکانی ئەمریکایە لە ناوچەدا. بەلام تورکیا پی ی وایە بو زیاتر توکمەکردنی باری ئەمنی ناوخوی ولات و ریگاگرتن لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد لە تورکیا، ئەمرو پیویستی بە یارمەتی و کومەکی ئەمنی ولاتانی دراوسی یە نەوەك ملدانە دەست گوشارە سیاسی و ئابووریەکانی ئەمریکاو ئەورووپا بو چارەسەرکردنی کیشەی کوردو پاراستنی مافی مروڤ لە تورکیادا. بەلام بوونی کیشەی تایبەتی نیوان تورکیاو سوریا لە لایەك و تورکیاو ئیران لە لایەکی تر ریگرە بە ردەم بە ئاکام نەگەیشتنی پلانەکانی ئەو سی ولاتە لە ناوچەکەدا.

سەبارەت بە دارشتنەوەی پەیوەندییەکانی نیوان تورکیاو لیبیاو ئیسرائیل. دوو مەبەستی بە خووە گرتووە، یەکەمیان بە مەبەستی پتەوکردنی پەیوەندییە ئابووریەکانە. دووەمیشیان بەمەبەستی سیاسیە. جا ئەگەر بیت و چاویك بە پەیوەندییە ئابووریەکانی نیوان تورکیاو لیبیادا بخشینینەوە لە سالانی (٨٠)دا. ئەوراستیەمان بو دەردەکەویت، کە زیاتر لە (٩٠) کومپانیای تورکی لە لیبیادا دەست بەکاربوون، جگە لەوە کریکاریکی زوری تورکیش لە ریگای ئەو کومپانیایانە خرابوونەگەر. ئەمەشیان سەرچاوەیەکی داهاتی گرنگ بوو بو دەستەبەرکردنی سەرمایەی بیانی بو نموونە (دەزگای تاهوت کونوردی یومو)ی تورکی بو لیکولینەوەو ئامادەکردنی پروژە لە لیبیادا (٣٦٣) ملیون دولاری دەست کەوتبوو. هەروەها دەزگای (میسا مسکین) عقدیکی (٢٣٠) ملیون دولاری

هه بوو له لیبیا ، ده زگای (ساراك ئوغولو) ش عقدیکی تری به به های (٩٥٠) ملیون دولاری هه بوو . جگه له وه لیبیا سه رچاوه یه کی گرنگی نه وت بوو بو تورکیا ، هه روه ها له نیوان سالانی (١٩٧٩ ــ ١٩٨١) که ل وپه له نیردراوه کانی تورکیا بو لیبیا له (٤٣) ملیون دولار به رزبووه بو (٤٤٢) ملیون دولار . واته ئه مرو تورکیا ده یه ویت دووباره په یوه ندییه ئابووریه کانی خوی له گه ل ئه م سه رچاوه ئابووریه بو تورکیا پته وتر بکات . سه باره ت به مه به سته سیاسیه کانی تورکیاش له دارشتنه وه ی ئه م جوره په یوه ندیانه خوی له وه به رجه سته ده کات . که تورکیا ده توانیت (استفزازی) سیاسه تی ئه مریکا بکات له ناوچه که و هه روه ها به بیر ئه مریکاش بینیته وه ، که تورکیا له تواناى دایه گوشاربخاته سه ر سیاسه تی ئه مریکا ، تا وا له ئه مریکا بکات مل که چی بوچوونه کانی تورکیا بیت و چاو له کیشه ناوخوییه کانی ئیستای تورکیا بپوشی . له جیاتی ئه وه ئه مریکا زیاتر گرنگی به مانه وه ی قه واره ی ئیستای تورکیا بدات . چونکه تورکیا چاك ئاگاداره که ئه مرو لیبیا به هوی سه ر پیچی یه کانی له راسپارده و بوچوونه کانی ئه مریکا له ناوچه که و ، خاوه ن داری یه تی چه کی ناووکی، تووشی بایکوتیکی سیاسی و ئابووری کوشنده هاتووه له لایه ن ئه مریکاو ئه ورپاوه . ئه مه یان پوختنه یه ك له په یوه ندییه کانی نیوان تورکیاو لیبیا . سه باره ت به په یوه ندییه کانی تورکیاش به ئیسرائیله وه ، له شویتیکی تری ئه م باسه دا دیینه وه سه ری . جگه له مانه تورکیا زور به په روشه هه مان جوری په یوه ندی له گه ل سه رجه م ولاتانی عه ره بی دابریژیته وه ، به تایبه تی ولاتانی که نداو بو نمونه ئه گه ر بیت و سه یری په یوه ندییه بازرگانیه کانی نیوان تورکیاو سعودیه بکه ین ، بومان ده رده که ویت ئه م په یوه ندییه به رده وام له به رزبوونه وه دابووه . وه ك له م ژماره و کتابه ی خواره وه ده رده که ویت ، له سالی ١٩٧٩ به های په یوه ندییه بازرگانیه کانی نیوان هه ردوولا خوی له(٢٠) ملیون دولاردابوو. که چی ئه م ژماره یه له سالی ١٩٨١ به رزده بیته وه بو (١٧٨) ملیون دولار،جابویه تورکیا به رده وام هه ولی داوه سه رچاوه ی ترو بازاری نوی تر بو ساغ کردنه وه ی که ل وپه له به رهه مهیتراوه کانی و ده سته به رکردنی ئه و که ل وپه لانه ی پیویستی یه تی بدوزیته وه . بویه روو له بازاره ئابووریه کانی ولاتانی عه ره بی ده کات . جگه له وه فاکته ریکی هه ره گرنگ تر هه یه ، که تورکیا به ره و ولاتانی عه ره بی به تایبه تی و ولاتانی روژهه لات په ل کیش ده کات . ئه ویش فاکته ری بوونی ئایین و میژوو و روشنبیری هاوبه شه له گه ل عه ره به کان . که خویان له که لتووری ئیسلام دا ده دوزنه وه . به تایبه تی که ئیستا ئوسولیه کانی تورکیا له گه شه کردن دان ، پاش ئه وه ی که سه روکایه تی شاره وانی دووشاری گه وره ی وه ك ئه نقه ره و

ئه سته مبولیان له ده سته . به لام هه ر ئه م فاکته ره شه تارادە یه ك بوته به ربه ست له به رده م تورکه کان. که ببینه ئه ندام له خیزانی ئه ورووپی .. بو نمونه له کاتی گفتوگوی وه رگرتنی تورکیا له نیو په یمانی (ناتو)، ولاتانی ئه سکه نده نافی سه ره تا رازی نه بوون تورکیا بیته نیو ئه و په یمانه. چونکه ولاتیکی (مه سیحی) نی یه ؟! جا بویه تورکیا وای پی باشه که مل نه داته ئه و هه مو گوشارانه ی ئه مریکاو ئه ورووپا ،کاتی که ئه م هه موو سه رچاوه ئابووری و بازاره ده وله مه ندانه ی له به رده ستابیت ؟!

# بوچی ئه مریکاو ئه ورووپا گوشار ده خه نه سه ر تورکیا؟!

لیره دا هه ول ده ده ین وه لامی ئه و پرسیاره بده ینه وه. ئایا بوچی ئه مریکاو ئه ورووپا، بو چاره سه رکردنی کیشه ناوخویی و ده ره کیه کانی تورکیا گوشاری سیاسی و ئابوری ده خه نه سه رتورکیا؟!

دوای نه مانی جه نگی ساردو هه لوه شاندنه وه ی یه کیتی سوڤیه ت و له بار هه لته کاندنی په یمانی وارشوو هه ره س هینانی رژیمه سوسیالیسته کانی ئه ورووپای روژهه لات ، ئه مریکا ده یه ویت له مه ودوا به شیوه یه کی دیکه و جوریکی تر شه رگه کان و جوری سنوره داریژراوه کانی کاتی جه نگی سارد دابریژیته وه هه ر بویه شه ئه مرو ئه مریکاو ئه ورووپا هه ولیکی زور ده ده ن ،تائاشتیه کی یه کجاره کی له ناوچه ی روژهه لاتی ناوه راستدا به رقه رار بیت که له کاتی جه نگی سارددا شه رگه یه کی سه ره کی نیوان ناتوو وارشو بوو. هه ربویه ئه مه ریکاو ئه ورووپا هه ولی گرتنی ئه و کون و که له به رانه ده ده ن ، که ده بنه مایه ی جیگا له ق کردنی ئاشتی له ناوچه که دا. جا ئه و هه ولانه به چاره سه ری یه کجاره ی بیت ، وه ك چاره سه رکردنی کیشه ی عه ره ب و ئیسرائیل. چ به هیور کردنه وه ی سرکردنی هه ندیك کیشه ی تربیت وه ك کیشه ی کورد .

هه روه ها چاره سه ر نه کردنی ئه وکیشانه ، جوره ئیزدواجیه تیك له نیوان دروشمه کانی (مافی مروڤ و دیموکراسی و بازاری ئازادی )سیسته می نویی جیهان و هه لسوکه وتی داریژه رانی ئه و سیسته مه دینیته کایه.

(چونکه ژیرخان و پایگا مادییه کان و سیسته می نویی جیهان ، ئه وه یه که بازاری سه رمایه داری جیهان له ئه ورووپا ، له هه ر شوینیکی تری جیهان به ره و یه کبوون ببات، به لام بازاری سه رمایه داری یه کگرتووش، پیویستی به ئازادی هه یه ئازادی جولانه وه ی سه رمایه ، ئازادی به کارهینانی سه رمایه ، ئازادی تاکه

که سی ، ئازادی یاسا سه رمایه دارییه کان له هاوکاری کردن ، ئازادی توانای یاساکانی بازار، که ئه مانه ش خویان له سیسته می دیموکراتی لیبرالی (سه رمایه داری) دا ده دوزنه وه ، هه روه ك چون بازاره کانی سه رمایه داری نیشتمانی ، له سه ره تای چه رخی بورجوازیدا، بانگهیشته ی ئازادی تاکه که س و دیموکراتی و سیسته می په رله مانی سه رمایه داری ده کرد، هه ربویه شه ئه مرو سیسته می نوی ی جیهان ، جاری ئازادییه کان و مافه دیموکراتیه کان ده دات له جیهانی هاوچه رخ دا ، سه باره ت به جاردانی پاراستنی مافی مروڤیش له جیهاندا، ئه مه شیان رووی دووه می ئه م سیاسه ته یه ، که کاتی سه رمایه داره کان ئه م دروشمه یان له جه نگی سارددا وه ك چه کیك دژ به سوسیالیسته کان به کار ده هینا ، چونکه زوربه ی خه لکی به ره ی سوڤیه ت له م مافه بی به ش بوون ، به لام ئیستا له گه ل وه رچه رخانی جیهان ، ئه م دروشمه ش ، بوته دروشمیکی گشتی به ربلاو، وه ك قاعیده یه ك به پله ی جیاواز هه موو ولاتانی جیهانی گرتوته وه)* جا بو ئه وه ی هیچ جوره ئیزدواجیه تیك له نیوان دروشم و کاره کانی دا نه بیت ، ئه مرو ئه مریکا و ئه ورووپا داوای جی به جی کردنی ئه م دروشمانه له تورکیا ده که ن ، به تایبه تی ئه گه ر تورکیا بیه ویت ببیته ئه ندامیکی خیزانی روژئاواییه کان ، چونکه مه رجی چوونه نیو ئه و خیزانه ، جیگیربوونی باری سیاسی و ئابوری ئه و ولاته یه که ده یه ویت ببیت به ئه ندام ، جا ئه گه ر باری سیاسی ئه و ولاته جیگیر نه بی ، بی شك باری ئابووریشی جیگیر نابی ، یا به پیچه وانه وه ، ئه مه شیان ده بیته به ربه ستیك له به رده م جموجول و گه شه کردنی سه رمایه ، هه رچه نده ئه مریکاو ئه ورووپا له سه رده می جه نگی سارددا هه مان ئه و داواکاریانه یان رووبه رووی تورکه کان ده کرده وه ، به لام بو ئه وه ی به ره کانی جه نگی ساردو شلوق و بی هیز نه بی ، چاوپوشی له جی به جی کردنی ئه و داواکاری و مه رجانه کراوه ، به لام ئه مرو له جیهانی دوای جه نگی سارد، ئه م مه رجانه ، وه ك پرنسیپیکی ژیانیان لیهاتووه بو په ره پیدان و گه شه پیدانی سیسته می نوی ی جیهان ، ئه مه یان له لایه ك . له لایه کی تر ئه مریکاو ئه ورووپا به و چاوه گرنگه ی سه رده می جه نگی سارد، ئه مرو ناروانئه جیوپولیتیکه که ی تورکیا، که سنووریکی (٦١٠) کیلومه تری هاوبه شی له گه ل سه خت ترین و به هیزترین دوژمنی (ناتو) هه یه ، بو پاریزگاری کردن له روژهه لاتی ده ریای ناوه راست له هه ر هیرشیکی سوڤیه تی چاوه روانکراودا، که به م دوو هویه وه تورکیا توانی جیگای خوی له نیو لیستی یارمه تیه کانی ئه مریکاو ناتودا بکاته وه و هه روه ها ببیته ئه ندامیکی بارگرانی سه ر (ناتو) و بازاری هاوبه شی ئه ورووپا ، که توانی سالانه سه دان ملیون دولار له بودجه ی ،ئه و ولاتانه دادوشی ، که ئه مروش یه کیتی سوڤیه ت له ئارادا نه بی ،

باشه بوچي ئه مریکاو ئه ورووپا ئه و پارمه تي و کومه که بي ژماره یه بده ن به تورکیا؟ بو ئه وه ی جینوسایدی گه لي کوردي پي بکات له تورکیا؟ یا شه ري زلهیزي دژي کونه دوژمنه کاني وه ك یونان و ولاتاني به لقان و ئه رمه نه کاني پي بکات و ئاشتي و ئاسایشي ناوچه که و به رژه وه ندییه کاني ئه مریکاو ئه ورووپا له ناوچه که بخاته مه ترسي و خه ته ره وه، به تایبه تي ئه مرو تورکیا خالیکي په یوه ندي گرنگه له نیوان سي ناوچه ی هه ره ده وله مه ندي نه وته له جیهان، که ئه وانیش ناوچه کاني قه فقاس و رومانیاو روژهه لاتي ناوه راسته، هه ربویه ئه مرو له پال ئه م راستیانه دا ئه مریکاو ئه ورووپا شیوه ی مامه له کردني خویان له گه ل تورکیادا گوریوه، ئیستا وه ك رژیمیکي دکتاتوري و عه سکه رتاري دژ به مافي مروڤ و دیموکراسي و بازاري ئازاد مامه له له گه ل تورکیا ده که ن. ئه وان ئه مرو تورکیایه کي خاوه ن سیسته میکي دیموکراسي راسته قینه و علمیانه تیان ده ویت، نه وه ك تورکیایه کي سه رده مي جه نگي سارد، که هیشتا به عه قلیه تي ئه و سه رده مه به سه رچووه، ره فتارو مامه له ده کات، تا تورکیاش به م شیوه یه ره فتار بکات، ئه ورووپاش مه رجي قورستري ده خاته سه ر، ئه گه ر بیه وي ببیته ئه ندامي بازاري هاوبه شي ئه ورووپا، چونکه ئه ورووپا هه روه ك پیشتر باسمان کرد، تورکیا به ولاتیکي کامل بوو نازمیرن، چونکه هیشتا باره ئابووري و سیاسیه که ی جیگیرنه بووه.

هه روه ها ده بیت تورکیا ئه و راستیه ش چاك بزاني، که ئیستا چه ندین ولاتي ئه ورووپای روژهه لات سازو ئاماده ن بو ئه وه ی بچنه نیو ئه و بازاره، که له چه ندین رووه وه له ئه ورووپای روژئاوا نزیکن. هه ربویه شه روژ له دوای روژ گوشاره ئابووري و سیاسي یه کاني ئه مریکاو ئه ورووپا به گورترو به ته وژمتر ده بن، به لام تورکیا بو خو ده ربازکردن و مل نه دانه ئه و گوشارانه ریگای دبلوماسي تري گرتوته به ر، ئیستا رووی له ولاتاني عه ره بي و ئیسلامي کردوه، به لام ئه مه یان کاریکي نوی ني یه له بواري سیاسه تي ده ره وه ی تورکیا، هه روه ها بابه تیکي تازه ی سه رلاپه ره ی روژنامه کانیش ني یه، چونکه ئه م به لا شکانه وه یه ی سیاسه تي ده ره وه ی تورکیا به ره و روژهه لات، له گه ل سه رهه لداني قه یراني قوبرس له سالي ١٩٦٤ به ته واوه تي گه لاله کراوه، له و کاته وه تائیستا تورکیا سیاسه تي شکانه وه ی به لای روژهه لات دا وه ك (خط رجعه) یه ك به کارهیناوه به رامبه ر به گوشاره کاني ئه مریکاو ئه ورووپاو به رده وامیش ئه و که نالّه په یوه ندي یه کاني له گه ل تورکیا له هه لچوون و دابه زین بووه. جا له م روانگه یه وه ده توانین بلیین ئه مرو کیشه ی کوردو کیشه ی قوبرس دوو خالي وه رچه رخانن له گوریني سیاسه تي ده ره وه ی تورکیا، له روئاواوه بو روژهه لات. بوچي ؟!

سالی ١٩٦٤، سالیکی گرنگە لە ریرەو گوریەنی سیاسەتی دەرەوەی تورکیا لە روژئاواوە بەرەو روژهەلات، لەم سالە بەدواوە تورکەکان بو خو دەربازکردن لە گوشارەکانی ئەمریکاو ئەوروپا، دەروازەیەکی تریان بو تەراتین کردنی دبلوماسیەتی دەرەوەی خویان دوزییەوە، کە لە ماوەی (٤١) سالی رەبەقدا ئەم دەروازەیە پشت گوی خرابوو، ئەویش دەروازەی ولاتانی عەرەبی و ئیسلامی بوو.. بویە دەتوانین بلیین کیشەی قوبرس یا سالی ١٩٦٤، سالی بە ئاگاهاتنەوەی تورکەکان بوو، بو پەیرەوکردنی جورە دبلوماسیەتیکی سەربەخو، کە تائەمروش تورکەکان سوود لەو دەروازەو کەنالە نوییە وەردەگرن، بەتایبەتی دوای زیاد بوونی گوشارەکانی ئەمریکاو ئەوروپا لەسەر تورکیا، بو چارەسەرکردنی کیشە ناوچەیی و ناوخوییەکانی تورکیا، بەلام تورکەکان بو خو دەربازکردن لەو گوشارانە، ئەم کەنالە دبلوماسییەیان هەردەم وەك (خط رجعة) یەك بەکارهیناوە بەرامبەر بەو گوشارانە، وادیارە ئەمروش دووبارە تورکەکان هەولی جوشدانەوەو بەگەرخستنەوەو دامەزراندنەوەی پەیوەندییەکانیان لەگەل ئەم کەنالە دبلوماسیە دەدەنەوە، بەلام ئەوەی لیرەدا جیگای سەرسورمان و پرسیاربیت ئەوەیە؛ کە تا ئیستا ئامانجی گرتنەبەری ئەم جورە دبلوماسیەتە، هەر لە چوارچیوەی هەولە تاکتیك و مەرحەلیەکاندایەو هیشتا ئەم هەولانە لە بواری سیاسەتی دەرەوەی تورکەکان نەچوتە قالبیکی ستراتیجیانەی بەرنامە داریژراودا!! بەلام وادیارە تەنیا مەبەست لە پەیرەوکردنی ئەم جورە دبلوماسیەتە ئەوەیە، تورکیا دەیەویت ئەمرو خوی لەو گوشارە سیاسی و ئابووریانەی ئەمریکاو ئەوروپا بدزیتەوە، کە بو چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کیشەی کورد لە تورکیادا دەیگرنەبەر، جا لەو پیوەندگەوە دەتوانین بلیین ئەمرو کیشەی کوردو کیشەی قوبرس، لەلایەن تورکەکانەوە بەیەك چاو و یەك کیش لە پارسەنگ دەدریت، بویە بەچاکی دەزانین بەپوختی باسی کیشەی قوبرس بکەین، بو ئەوەی بتوانین بەشیوەیەکی بابەتیانە لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمرو و دوینی ی تورکیا بگەین، بەلام سەرەتا حەز دەکەین چەند خالیکی هاوبەش لە نیوان هەردوو کیشەکە، لە بوارەکانی ئابووری و سیاسی و بارودوخی سیاسەتی دەولی و ناوچەیی ئەو کاتانەی روژگاری دوینی و ئەمروی هەردوو کیشەکە بخەینە بەرچاو، و پاشان ئاماژەش بو قوناغە سەرەکیەکانی دبلوماسیەتی دەرەوەی تورکیا بکەین و هوکارەکانی ئەو گورانکاریانەش شی بکەینەوە.



## «خاله هاوبه‌شه‌كانی هه‌ردوو كیشه‌كه»

* كیشه‌ی كورده‌كان و كیشه‌ی توركه قوبرسه‌كان، هه‌ردووكیان خویان له‌ چوارچیوه‌ی بنه‌مای (قه‌ومیه‌تی) ئه‌تاتوركدا یه‌ك ده‌گرنه‌وه‌ له‌ حاله‌تی یه‌كه‌مدا توركه‌كان ده‌كه‌ونه‌ سه‌نگه‌ری دژایه‌تی كردنی كوردو، له‌ حاله‌تی دووه‌مدا ده‌كه‌ونه‌ سه‌نگه‌ری به‌رگری له‌ توركه‌ قوبرسیه‌كان.

* ده‌سه‌لاتداریه‌تی (سلیمان دیمریل) له‌ سالی ١٩٦٥، له‌ پوستی سه‌روك وه‌زیران، ئه‌مروش ده‌سه‌لاتداریتی (سلیمان دیمریل) له‌ پوستی سه‌روك كومار، واته‌ جله‌وی ده‌سه‌لات له‌ هه‌ردوو زه‌مه‌نه‌كه‌دا له‌ ژیر كونترولی راسترەوه‌ نه‌ته‌وه‌ په‌رستە‌كانی تورك.

* گوشاری ئه‌مریكاو ئه‌وروپا بو چاره‌سه‌ركردنی كیشه‌ی قوبرس له‌سه‌ر توركیا، ئه‌مروش به‌هه‌مان شیوه‌ گوشاری ئه‌و دوولایه‌نه‌ بو چاره‌سه‌ركردنی كیشه‌ی كورد له‌ توركیا.

* له‌ سالانی (٦٠)دا نرخی یه‌ك دولار به‌(٩) لیره‌ بوو. ئیستا نرخی یه‌ك دولار به‌(٤٣) هه‌زار لیره‌یه‌، كورت هینانی بودجه‌ی ده‌وله‌ت له‌ سالی (١٩٦٣) به‌ ریژه‌ی (١١٦) ملیون دولار بوو، له‌ سالی (١٩٩٤) یشدا گه‌یشته‌ (٧) ملیار دولار، له‌ سالی (١٩٦٨) قازانجی قه‌رزه‌كانی توركیا خوی له‌(٢,٧) ملیون دولار ده‌دا. به‌لام ئیستاش بی شك ریژه‌ی قازانجی قه‌رزه‌كانی سه‌ر توركیا زیاتره‌، چونكه‌ قه‌رزه‌كان تادی كه‌له‌كه‌تر ده‌بن، جا له‌به‌رئه‌وه‌ قازانجی قه‌رزه‌كانی سه‌ر توركیا جیگیرنی یه‌، چونكه‌ به‌گه‌لیك كیشه‌ی ئابووری و سیاسی گریدراوه‌، بویه‌ نه‌توانادا نی یه‌ به‌ ریژه‌یه‌كی دیاریكراو ده‌ست نیشانی بكه‌ین.



# قوناغەکانی دبلوماسیەتی دەرەوەی تورکیا

ئەگەر بیت و هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەولەتی تورکیا لە سالی ١٩٢٣ وە تا ئەمرو، سەیری دبلوماسیەتی دەرەوەی تورکیا بکەین. بومان دەردەکەویت، کە ریرەوی چالاکیە دبلوماسیەکانی دەرەوەی تورکیا بە ٣ قوناخی جیاوازدا پەل و پوی هاویشتووەو هەر یەکە لەو قوناخانەش. لە ئەنجامی کاردانەوەی بایکوتیکی سیاسی و دبلوماسی و ئابووری بن بەست بووە. بەلام ئەوەی جیگای سەرنج بیت لەم ٣ قوناخەدا. تەنیا قوناخی یەکەمی توانیویەتی (پارسەنگی میزەکان،) لە بەرژەوەندی تورکیادا رابگریت و بیپاریزیت. بەلام دوو قوناخەکەی تر بە بەردەوامی بەزەرەرو جیگیرنەبوونی دبلوماسیەتی تورکەکاندا شکاوەتەو، تورکیای تووشی چەندین قەیرانی ئالوزترو سامناکترکردووە. قوناخەکانیش ئەمانەن.

* قوناغی یەکەم لە سالی (١٩٢٣ ــ ١٩٤٥) بوو. لەم قوناخەدا تورکیا پەیرەوی ئەو بنەمایەی ئەتاتورکی دەکرد، کە دەیوت (السلم في الداخل، والسلم في الخارج) واتە ئاشتی لە ناوەوەو لە دەرەوە. کە توانیبووی جورە هاوسەنگیەکی ژیرانە لە نیوان روژهەلات و روژئاوا پەیرەو بکات. و لەگەل هەردوو جیهانی سوسیالیستی و سەرمایەداری مامەلەی دەکرد. بەلام لەم قوناخەدا تورکیا بەتەواوەتی خوی لە گیژاوی وولاتانی عەرەبی و ئیسلامی دوورخستەوە.

* قوناغی دووەم، لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە دەست پی دەکات. لە سالی (١٩٤٥ ــ ١٩٦٤). لەم قوناخەدا تورکیا بەتەواوەتی خزایە نیو باوەشی ئەمریکا. بو ئەو مەبەستەش تورکیا و یونان بەپی ی هەردوو پروژەی (ترومان و مارشال) یارمەتی سەربازی و ئابووریەکانیان لە ئەمریکاوە دەستەبەر کرد. لە

١٢ی ته ممووزی ١٩٤٧) تورکیا پروژه ی ترومانی بو ده سته به رکردنی یارمه تیه ئابوورییه کانی ئه مریکا مورکرد. تورکیا و یونان (٧٠٠) ملیون دولاریان ده ست که وت. هه روه ها له سالی (١٩٤٨)دا تورکیا پروژه ی (مارشال) ی بو ده سته به رکردنی یارمه تیه سه ربازییه کان له گه ل ئه مریکا مور کرد. ئه وه بوو تورکیا له گه ل یونان (٧٦٤) ملیون دولاری تریان به ده ست که وت. جگه له وه له سالی (١٩٥١) تورکیا له په یمانی ناتو به ئه ندام وه رگیرا. دوابه دوای ئه وه تورکیا دوای گفتوگویه کی زور له (١٢ ئه یلولی ١٩٦٣) په یمانی ئه نقه ره ی مورکرد. له و په یمانه ش دا هاتبوو که تورکیا له (١ کانونی دووه می ١٩٦٤) ده توانی به سی قوناغ (ئاماده کردن، وه رچه رخان و کوتایی) به شداری بازاری هاوبه شی ئه وروپا بکات. هه روه ها تورکیا بو ئه وه ی زیاتر دلسوزی خوی بو هاوپه یمانه نوی یه کانی نیشان بدا، له سالی (١٩٥٠) به شیك له هیزه کانی خوی ره وانه ی شه ری کوریا کرد. هه روه ها تورکیا به راسپارده ی ناتو چه ندین په یمانی عه سکه ری له روژهه لاتی ناوه راست و روژهه لاتی ئه وروپا وه ك (سه نتو و به لقان) سازدا. به لام لیره دا پرسیاریك دیته ئاراوه، ئه ویش ئه وه یه، ئایا بوچی تورکیا به و شیوه یه ده خزیته نیو باوه شی ئه مریکاو ناتو و هوکاره کانی په یره وکردنی ئه م جوره دبلوماسیه ته چی یه ؟! له وه لامدا ده لیین، له کاتیکدا تورکیا ئه م جوره سیاسه ته ی په یره وکرد، کاتیك ستالین له سالی (١٩٤٥) دوای ته واوبوونی جه نگی جیهانی دووه م. گوشاریکی زوری خسته سه ر تورکیا و داوای هه ردوو ویلایه تی (قارس و ئه رده هانی) له تورکیا کرده وه. هه روه ها سوڤیه ت داوای چاوپیخشانه وه ی ریکه وتنی (مونتروی) کرد، که پی ی ئه و ریکه وتنه تورکیا ده سه لاتی ته واوی به سه ر هه ردوو گه رووی بسفورو ده رده نیل دا هه بوو. سوڤیه تیش داوای دامه زراندنی بنکه یه کی سه ربازی سوڤیه تی ده کرد له سه ر ئه و دوو گه رووه. جگه له وه سوڤیه ت بو به رژه وه ندی بولغاره کان، داوای چاوپیخشانه وه ی به سنووری (تراقیا ده کرد).

تورکیاش ئه م هه ره شه و داواکارییانه ی سوڤیه تی به هه ره شه یه کی راسته وخو ده زانی بوسه ر سنوورو سه روه ری خاکی تورکیا. بویه له م قوناخه دا ئه و جوره دبلوماسیه ته ی گرته به ر.

* قوناغی سی یه م. له سالی (١٩٦٤)ه وه ده ست پی ده کات تا روژگاری ئه مرو. ئه م قوناخه به قوناخی به ئاگا هاتنه وه ی تورکه کان ده ژمیردری، له و جوره دبلوماسیه ته کویرانه یه ی، که له ماوه ی (١٩) سالی رابردوودا په یره ویان ده کرد له (١٩٤٥ ــ ١٩٦٤). بو رازی کردنی ئه مریکا و ئه وروپا. تورکه کان له ماوه ی ئه و

(١٩) ساله دا، وايان مه زه نده ده كرد. ئه گه ر توركياش هه ر كاريت بكات بو پاراستنی به رژه وه ندییه بالاكانی توركیا. ئه مریكا و ئه وروپا پشتگیری لی ده كه ن و یارمه تی مادی و مه عنه ویشی ده ده ن. به لام كیشه ی قوبرس له سالی (١٩٦٤) توركیای له و خه وه خوشه راپه راندو توركه كانی گه یانده ئه و راستیه، كه ده بیت توركیا به رژه وه ندییه كانی له ئه مریكاو ئه وروپا له سه رووی به رژه وه ندیی یه كانی خوی به بالاترو شكومه ندتر ره چاو بكات.

له كاردانه وه ی ئه م هه لویسته ی ئه مریكاو ئه وروپا دا، ده نگی ناره زایی له نیو توركه كان به رزبووه، تیایدا داوا له ده سه لاتدارانی تورك كرا، كه ده بیت له مه ودوا توركیا له بواری سیاسه تی ده ره وه یدا، سه ربه خویی خوی بپاریزیت، بو ئه وه ی بتوانی داكوكی له به رژه وه ندییه بالاكانی توركیا بكات. ئه م ده نگانه ش له دوای هه لبژاردنه كانی سالی (١٩٦٥) زور به زه قی ده بیستران و چه ندین بو چوون و شیوه ی مامه له كردنی نویتر له گه ل دوسته كانی توركیا، خرایه به رده م داریژه رانی سیاسه تی ده ره وه ی توركیا، بوچوونه كانیش ئه مانه بوون.

* بوچوونیك داوای ده ست كیشانه وه ی ته واوی له نیو (حلفه روژئاواییه كان) ده كرد. هه لگرانی ئه م بوچوونه ش پارتی كاری توركی بوون. كه ئوبالی ئه و زیانانه ی به توركیا گه یشتوون، ده خسته ئه ستوی ئه مریكاو ئه وروپا.

* بوچوونیكی تر وای به چاك ده زانی، ده بیت توركیا له نیو ئه و (حلفانه) دا بمینیته وه، به لام به مه رجی سه روه ری نه ته وه ی توركیا پاریزراوبی.

* بوچوونیكی تریش داوای ده كرد، تا بكری جیگای توركیا له نیو ئه و (حلفه) عه سكه ریانه دا به هیزتر بكریت.

واته لیره وه بومان ده رده كه ویت، كه زوربه ی توركه كان داوای په یره وكردنی جوره دبلوماسیه تیكی سه ربه خویانه یان ده كرد. ئه ره بوو توركیا له م ساله به دواوه هه ولی سه ربه خوی كردنی دبلوماسیه تی ده ره وه ی خوی داو، به شیوه یه كی زور زه قیش له دبلوماسیه تی ده ره وه ی توركیادا ره نگی دایه وه.، هه ول ده ده ین چونیه تی په یره وكردنی ئه و جوره سه ربه خویی یه له دبلوماسیه تی ده ره وه ی توركیا بخه ینه به رچاو.

## «كیشه ی قوبرس و سه ربه خویی دبلوماسیه تی توركیا»

دوورگه ی قوبرس ده كه ویته به شی روژهه لاتی ده ریای سپی ناوه راست (٥٠) میل له توركیاو (٧٠٠) میل له یونانه وه دووره، رووبه ره كه شی (٩٢٥٠) كم ٢ یه، به پیی ئاماره كانی سالی ١٩٦٨ ژماره ی دانیشتوانی قوبرس (٦٠) هه زار كه س بوو، دانیشتوانی ئه م دوورگه یه له توركه قوبرس و یونانه قوبرسیه كان پیك دیت.

تورکه کان (٣٠ ٪) دانیشتوانی دوورگه که پیك دینن و یونانیه کانیش (٧٠ ٪)ی. ئه م دوورگه یه له سالی (١٥٧١) له لایه ن عوسمانیه کانه وه داگیرکرا. له سالی (١٨٧٨) عوسمانیه کان بو به ریتانیا وازیان له م دوورگه یه هینا. چونکه ئه م دوورگه یه گرنگیه کی تایبه تی و ستراتیجی و عه سکه ری هه یه بو به ریتانیا.

١. ده روانیته سه ر که نالی سویس.

٢. شوینیکی گرنگه بو پاراستنی به رژه وه ندییه کانی ئه وروپا له روژهه لاتی ناوه راستدا که ده که ویته سه ره ری ی رنگای(ده ریای ناوه راست ــ ده ریای سور ــ ئوقیانووسی هیندی).

ئه وه بوو به ریتانیا له سالی (١٩٥٩) له گه ل یونان و تورکیادا، به پی ی هه ردوو په یمانی زیوریخی سالی (١٩٥٩)و په یمانی له نده نی سالی (١٩٦٠) سه ربه خویی دا به م دوورگه یه. هه روه ها له و په یمانه دا، به چه ند خالیك چاره سه ری کیشه ی قوبرس کراوه، که گرنگترینیان ئه مانه ن :ــ

١. دان نان به سه ربه خویی قوبرس له لایه ن هه ر سی وولاته که وه.

٢. سه روکی قوبرس یونانی بیت و جیگره که ی تورك بیت.

٣. ده سه لاتی راپه راندن (٧) وه زیری یونانی بیت و (٣) وه زیریش له تورکه کان بیت.

٤. کورسیه کانی په رله مانیش به گویره ی ریژه ی دانیشتوانی هه ردوولا (٧٠ ٪) بو یونانیه کان بیت و (٣٠ ٪) بو تورکه کان.

٥. بنکه سه ربازییه کانی به ریتانیاش له و دوورگه یه دا بمیننه وه.

دوا به دوای ئه وه چه ندین ریککه وتننامه ی دوو قولی و سی قولی و چوار قولی له نیوان به ریتانیاو یونان و تورکیاو کوماری قوبرس به سترا، له گشتیاندا په یمانی له نده ن به کلیلی چاره سه ری کیشه ی قوبرس دووپات ده کرایه وه، هه روه ها تیایاندا ئاماژه بو ئه وه کرا، که نابیت ده وله تی تورکیا یا یونان ده ست له نیو کاره کانی کوماری قوبرس وه ربده ن.

هه رچه نده تورکیا ئه م په یمان و ریککه وتننامانه ی سه باره ت به قوبرس ساز ده دا. به لام تورکیا به رده وام دلی بو گرنگی ئه و دوورگه یه لیده دا، چونکه ئه م دوورگه یه گرنگیه کی تایبه تی هه یه بو پاراستنی به رژه وه ندیه کانی تورکیا له ده ریای سپی ناوه راستدا. به تایبه تی ئه گه ر بیت و یونان ده ست به سه ر ئه م دوورگه یه دابگریت، ئه مه یان ده بیته هوی ئه وه ی :

١. دوورگه کانی یونان، گه ماروی که ناره کانی خوارووو روژئاوای تورکیا بده ن،

ئه مه شیان وا ده کات، یونان بالا ده ست بیت به سه ر ده رگاکانی «بحر ایجه» که

رووی لە هەردوو گەرووی دەردەنیل و بسفورو گشت بەندەرەکانی تورکیا بکات، کە لە روژئاوای ئەستەمبولەوە دریژ دەبیتەوە تادەگاتە روژهەلاتی ئەسکەندەرونەو ئەزمیرو طوروس.

٢. دوورگەی قوبرس ناوچەیەکی ئابووری گرنگیشە بو تورکیا.

جا تورکیاش لە روانگەی ئەم مەترسیانەوە، دەرك بەگرنگی ئەو دوورگەیە دەکات، بویە بە هیچ شیوەیەك ناتوانی دەستبەرداری ئەو دوورگەیە بیت بو یونانیەکان. بەلام کاتی پاش ئەوەی سەروك کوماری قوبرس، لە سالی (١٩٦٤) وویستی دەستکاری دەستووری سالی (١٩٦٠)ی قوبرس بکات، تورکیا هەلیکی میژوویی بورەخسا. کە دیسانەوە کیشەی قوبرس گیانی بەبەردا بکاتەوە. ئەوەبوو ئەم کارەی سەروك کوماری قوبرس بووە مایەی گرژی پەیوەندییەکانی نیوان تورکیاو یونان، هەر بو ئەم مەبەستەش «عصمت اینینو»ی سەروك وەزیرانی تورکیا لەسالی (١٩٦٤) ووتی:

(ئەم بریارەی سەروك کوماری قوبرس، دەچیتە خانەی دژایەتی کردنی هەردوو پەیمانی زیوریخ و لەندەن. بویە تورکیا ئەرکی پاراستنی تورکە قوبرسیەکان دەگریتە ئەستوی خوی).

دوای ئەو لیدوانەی «عصمت اینینو»، بەریتانیا کەوتە خو بو خاوکردنەوەی گرژییەکانی نیوان تورکیاو یونان، تا نەگاتە رادەی هەلگیرساندنی شەر لە نیوان هەردوولا، بەتایبەتی کە هەردوولا ئەندامن لە پەیمانی ناتو، هەروەها ئەندامانی پەیمانی «ناتو»ش داوایان لە هەردوولا کرد، کە کیشەکە لە ریگای (UN) ەوە چارەسەر بکری. ئەمریکاش هەر لەهەمان سالدا هاتە نیو کیشەکەو پیشنیارەکانی خوی راگەیاند سەبارەت بە چونیەتی چارەسەرکردنی کیشە، بەلام ئەو پیشنیارانەی ئەمریکا لە بەرژەوەندی تورکەکان نەبوو و هەرگیزیش چاوەری ئەوەیان لە ئەمریکا نەدەکرد. پیشنیارەکانی ئەمریکاش ئەمانە بوون

* ١. تورکە قوبرسیەکان، دوورگەکە چول بکەن، لە جیاتی ئەوەش قەرەبویان بو بژمیردریت.

٢. دوورگەی قوبرس لەگەل یونان یەك بگریتەوە.

٣. یونانیش دوورگەکانی دودیکامیز بداتەوە تورکیا، هەروەها تورکیاش بنکەیەکی سەربازی لە دوورگەکەدا هەبی..

بەلکو ئەمریکا بەوەش نەوەستا، لە (٥ی حوزەیرانی ١٩٦٤) سەروك جونسون نامەیەکی پر لە هەرەشەی بو «عصمت ئینینو» ناردو، تیایدا بە راشکاوی بە تورکیای راگەیاند کە (تورکیا جگە لە سوڤیەت هیچ دوژمنیکی تری

نی یه، ئه گه ر تورکیا هیرش بکاته سه ر قوبرس، له وانه یه سوڤیه ت بیته نیوجه نگه وه، ئه و کاته ش ولاتانی په یمانی ناتو به رگری له تورکیا ناکه ن و ئه مریکاش وه ك چاودیر ده مینیته وه) له لایه کی تر ئه مریکا به تورکیای راگه یاند (که نابی یارمه تیه ئابووری و عه سکه ریه کانی ئه مریکا دژ به وولاتیکی ئه ندام له «ناتو» به کار بهینی) ئه م چاو لی سوور کردنه وانه ی ئه مریکا، وای له تورکه کان کرد، که هیچ کاریکی وا نه که ن پشبوی بخه نه ناوچه که و مل بو بریاره کانی (UN) که چ بکات.

ئه وه بوو له سالی (١٩٦٥) کیشه که رووبه رووی(UN) کرایه وه، ته نیا (٤) وولات پشتگیریان له تورکیا کرد، (٤٧) وولاتیش دژی داواکانی تورکیا بوون و (٥١) وولاتیش بی لایه نی خویان له کیشه که راگه یاند. به م شیوه یه کیشه ی قوبرس به لای یونانیه کان دا شکایه وه.

تورکیاش ئه م هه لویسته ی ئه مریکای به نیگه رانیه وه به رجه سته کرد. بویه وای له تورکه کان کرد که جاریکی تر چاو به ریککه وتننامه و په یمانه کانی نیوان خویان و ئه مریکاو ئه ورووپا دابخشیننه وه، جگه له وه له نیو تورکیادا چه ندین بالی چه پره و دژایه تی ئه مریکاو ئه ورووپایان ده کرد، هه روه ها رای گشتی تورکیش دوای ئه م هه لویستانه ی ئه مریکاو ئه ورووپا، تاره زایی خویان به رامبه ر به به رده وامی په یوه ندیه کانی نیوان تورکیاو ئه ورووپاو ئه مریکا ده ربری.

به لام ئه وه ی لیره دا جیگای سه رنج بیت، ئه وه یه که تورکه کان تا ئه و کاته له سیاسه تی ئه مریکاو ئه ورووپا نه گه یشتبوون، به تایبه تی ئه مریکا، که به هیچ شیوه یه ك رازی نابیت ئه م دوورگه یه به پیوانه ی کوریاو ڤیتنام دابه ش بکری و ته گه ره و کیشه ی تری بو دروست بکات. جگه له وه ئه مریکا به هیچ شیوه یه ك ریگای نه ده دا به تورکیا، که به شیوه یه کی سه ربازیانه خوی له قوبرس هه لقورتینی، چونکه ئه م کاره ی تورکیا راسته وخو ده بیته مایه ی لیك هه لوه شاندنه وه و له به ر یه کترازاندنی لای خوارووی په یمانی ناتو. جا تورکه کان له جیاتی ئه وه ی باشتر له سیاسه تی ئه مریکا بگه ن و ئامانجه سه ره کیه کانی ئه مریکایان له ناوچه که لاروونتر بی، بو ئه وه ی بتوانن به رژه وه ندییه کانی خویان له چوارچیوه ی «ناتودا» بپاریزن، که چی به پیچه وانه وه تورکه کان له و ساله یه دواوه به زه قی له دلسوزیك و خزمه تکاریکی مل که چی ئه مریکاو ئه ورووپا، ده بنه یاخی بووییکی سه رشیت، که وا مه زنده ده کرا ئه م کوره گه نجه روژهه لاتیه له ساله کانی هه شتادا ببیته ئه ندامیکی ده ست رویشتووی خیزانه که ی ناتو. به لام له ناکاویکدا ئه م هه موو بوچوون و لیکدانه وانه هه ره س دینن و ناتوانن خویان له و رووه روژهه لاتیه خه فه کراوه یان داته کینن و جاریکی تر

بەرەو باوەشی رۆژهەلات هەنگاو دەنینەوە، هەرچەندە هەستی کلیپە سەندووی تورکەکان لەو رووژانە دامرکایەوە، بەلام برینێکی قولی لە جەستەی تورکەکان جێی هێشت. ئەم برینەش لە سالی (١٩٦٤ ـ ١٩٧٤) تورکیا بە دەستییەوە دەتلایەوە، بەلام تورکەکان لە سالی (١٩٧٤) ئەو برینەیان بە داگیرکردنی رۆژهەلاتی قوبرس سارێژکرا. سەرەنجام بۆمان دەرکەوت، کە تورکەکان لە سالی (١٩٦٤)وە نیسچە سەربەخۆییەکیان لە بواری دبلوماسیەتی دەرەوەی خویاندا پەیرەو کرد، بەلام جۆرە دبلوماسیەتێکی سەر لێشێواوانەو هەلپەرستانە، کە خوی لە دوو ئاقاری جیاوازدا دەدوزیەوە.

١. پتەو کردنی پەیوەندییەکانی تورکیا لەگەل سوڤیەت.

٢. پتەو کردنی پەیوەندییەکانی تورکیا لەگەل وولاتانی عەرەبی و ئیسلامی.

## «پەیوەندییەکانی تورکیا لەدوای سالی ١٩٦٤ لەگەل سوڤیەت»

هەروەك لە پێشتردا ئاماژەمان بو ئەوە کرد، کە پەیوەندییەکانی نیوان تورکیاو سوڤیەت، بەهوی هەرەشەکانی ستالین ئالوزی تی کەوت، بەلام لە دوای مردنی ستالین لە (٣٠ مایسی ١٩٥٣)و دەستبەکار بوونی خروشوف، سوڤیەت لە ریگای روژنامەو رادیوییەکانیەوە، بە تورکیای راگەیاند، کە سوڤیەت لە داواکارییەکانی پیشووی پاش گەزبوتەوەو، ئیستا وەك دوو دراوسی داوای دارشتنەوەی پەیوەندییە ئاساییەکانی خوی لەگەل تورکیا دەکاتەوە، بەلام تورکەکان بەگومانەوە سەیری ئەو داوایەی سوڤیەتیان دەکردو، بە مناوەریەکی سیاسی و دبلوماسی سوڤیەتیان دەژمارد، بەردەوام خوی لەو بانگەوازانەی سوڤیەت گیل دەکرد. بەلام لەدوای سالی (١٩٦٤) لەبەر روشنایی کیشەی قوبرس، تورکیا ئەمجارەیان بەجدی کەوتە خو بو دارشتنەوەی پەیوەندییەکانی خوی لەگەل سوڤیەتدا، هەرچەندە ئەم هەولەی تورکیا لەگەل سوڤیەت یەکەم جار نەبوو، چونکە لە سالی (١٩٦٠) عەدنان مندرس ـ ی سەروك کوماری تورکیا، هەولی دامەزراندنەوەی ئەو پەیوەندییەی دا، بەلام کودەتاکەی (٢٧ مایسی ١٩٦٠) ئەم هەولەی تورکیای نەزوك کرد. لیرەدا پرسیارێك دیتە ئاراوە، ئەویش ئەوەیە. بوچی تورکیا دوای کیشەی قوبرس، هەولی دامەزراندنەوەی پەیوەندییەکانی خوی لەگەل سوڤیەت دەدا؟

بێ شك ئەم کارەش هوکاری خوی هەیە، کە خوی لەم هوکارانەدا دەدوزیتەوە:

١. بەسەبەستی دەستگیر کردنی پشتیوانی بلوکی رۆژهەلات لە(UN) بو بەلاشکانەوەی کیشەی قوبرس بەلای تورکەکان، بەتایبەتی پاش ئەوەی وولاتانی روژئاوا لە پەیمانی (ناتو) پشتیان لە داواکەی تورکەکان کرد.

٢. نزیك بوونەوە لە سوڤیەت. واتە كەمكردنەوە و ڕیگاگرتن لە یارمەتیە ئابووری و عەسكەریەكانی سوڤیەت، بۆ سەرۆك مكاریوسی سەرۆك كۆماری قوبرس. تا ئەو یارمەتیانە نەبنە پاڵپەستۆیەك بۆ سەر ئەورووپاو ئەمریكا، كە وا لەو دوو لایەنە بكات كێشەكە بەلای قوبرسیە كانیدا بشكێنێتەوە. چونكە بێبەش كردنی یونان لەم یارمەتیانە، دەبێتە هۆی ئەوەی، ئەمریكاو ئەورووپا وا لە یونان بكەن، بەو جۆرە چارەسەركردنانە ڕازی بێت كە لە بەرژەوەندی توركیادا بن.

٣. بێبەش نەكردنی توركیا لە یارمەتیە ئابووری و سەربازییەكانی سوڤیەت ئەگەر هاتوو لە كاتێكدا بەرژەوەندییەكانی ئەمریكاو ئەورووپا لە توركیادا نەمێنن.

هەربۆیە لە ساڵی ١٩٦٤ بەدواوە، چەندین سەردانی هەكوكی سەركردەكانی سوڤیەت و توركیا، ئەنقەرەو موسكۆیان بەسەركردەوە، یەكەم سەردانیش بە (ئیحسان كرمی) جێگری سەرۆكی حزبی عەدالە و سەرۆكی پەرلەمانی توركیا بۆ موسكۆ دەستی پێ كرد، دوابەدوای ئەوە لە ساڵی ١٩٦٥ سعاد خەیری سەرۆك وەزیرانی توركیا جارێكی تر موسكۆی بەسەركردەوە. هەروەها لە هەمان ساڵدا وەفدێكی باڵای سوڤیەت سەردانی توركیای كرد. پاشان سلێمانی دیمریل سەرۆك وەزیرانی توركیا لە ساڵی ١٩٦٧ سەردانی موسكۆی كردەوە، بۆ ئەو مەبەستەش بودگورەنی لە ساڵی ١٩٧٢ سەردانی ئەنقەرەی كرد. هاتوچۆی دبلۆماسی بەردەوام لە نێوان هەردوولا هەبوو. بەلام ئەم بەسەرنەكردنەوەی هەردوولا بێ ئاكام و سوود نەبوو بەڵكو توركیا بەپێی ڕێككەوتنێك لە ساڵی ١٩٦٧ بەڵێنی جێبەجێ كردنی ٢٧ پرۆژەی پیشەسازی گەورەی لە سوڤیەت وەرگرت، لەوانە (كارگەی ئاسن و پۆلاو ئەلەنیوم و پاڵاوگەی نەوت و دروستكردنی وێستگەیەكی وزەی ئەتومی، هەروەها دروستكردنی بەنداوێكی هاوبەش لەسەر ڕووباری (ئەریكی) تا جوتیارانی هەردوولا سوود لەو بەنداوە وەربگرن) لە بەرامبەر ئەمەشدا توركیا بەرهەمە كوشتاڵیەكانی خۆی لە سوڤیەت ساغ بكاتەوە.

شایانی باسە ئەم هاوپەیمانیتیە تا ڕوخانی یەكێتی سوڤیەت لە نێوان هەردوولادا بەردەوامبوو. بەلام دوابەدوای ئەو گۆڕانكاریانەی بەسەر سوڤیەت داهات، پەیوەندییەكانی نێوان هەردوولا ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو ئاڵۆزی دەڕۆیشت. ئەویش بەهۆی ئەوەی توركیا دەستی لە نێو كۆمارە سەربەخۆكانی ئەودیو قەفقاس وەردەدا. بەلام ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەوەیە كە توركیا نەیتوانی لە نێو پەیمانی ناتودا جێ پێی خۆی قایمتر بكات و متمانەی وڵاتانی ڕۆژئاوا بۆ خۆی زیاتر بكات. بەڵكو بەم كارەی گوشارەكانی ئەمریكاو ئەورپای لە سەرخۆ

زیاتر کرد . چونکە لەو کاتەدا مەحال بوو ولاتیکی پەیمانی ناتو بچیت لەگەل یەکیتی سوڤیەت دا ریکەوتنی ئابوری و دیبلوماسی مور بکات . بەتایبەتی ئەم کارە لەلایەن ئەمریکاوە زور بەنیگەرانیەوە سەیر دەکرا، چونکە تورکیا بنکەیەکی سەربازی هەرەگرنگی ئەمریکا بوو بو گوشار خستنە سەر سوڤیەت .

## پەیوەندییەکانی تورکیا لەدوای سالی ١٩٦٤ لەگەل جولەکەو عەرەب

ئەگەر بیت و سەیری سیاسەتی دەرەوەی تورکەکان بکەین ، بەرامبەر بەولاتانی عەرەبی ، تاسالی ١٩٦٤ لەلایەن تورکەکانەوە هیچ هەولیکی جدی نەدراوە بو دارشتنەوەی پەیوەندییە ئابووری و سیاسی و کەلتورییەکانی نیو هەردوولا . ئەگەر هەر هەولیکیش لە ئارادا بووبیت ، بەراسپاردەی ئەمریکا و ئەوروپا بووە ، هوکارەکانی سازنەدانەوەی ئەم جورە پەیوەندیانەش لەلایەن تورکیاوە دەگەریتەوە بو چەند هویەك .

* بەهوی ئەو سیاسەتە روشنبیری یەی ، ئەتاتورك دایرشتبوو ، ئەویش خوگریدان بوو بەشارستانیەتی روژئاواوەو خو دوورخستنەوەش لەشارستانیەتی کەلتووری عەرەبی ئیسلامی . ئەمەش بووە هوی ئەوەی کە تورکەکان گوشەگیری فیکری و شارستانی خویان دەرهەق بەکەلتوری ئیسلامی و عەرەبی بەرە بەرە قولتر بکەنەوە . بەلکو بو زیاتر خونزیك کردنەوەش لەروژئاوا ، تورکەکان سیستەمی تاك حزبی روژهەلاتیان لەسالی (١٩٤٥) رەت کردەوەو ، سیستەمی فرە حزبیان راگەیاند . تا بو روژئاواییەکانی بسەلمین . کە ئەوانیش دەتوانن ژیانیکی روژئاواییانە لەسەر سیستەمی بەریوەبردنی ولاتدا پەیرەو بکەن .

* لەشەری یەکەمی جیهانیدا ، تورکەکان تاوانی هەرەس هینانی ئیمبراتوریەتی عوسمانییان دەخستە ئەستوی عەرەبەکان .

* دەست بەسەرداگرتنی ولایەتی ئەسکەندەرونەی سوری لەسالی ١٩٣٩ لەلایەن تورکەکانەوە . بە هوکاریکی تر دادەنریت بو قول بوونەوەی ناکوکیەکانی نیوان عەرەب و تورك . کە تائیستاش سوریا داوای ئەو ولایەتە دەکاتەوە .

* بو زیاتر خو نزیك کردنەوە لە ئەمریکاو بەریتانیا ، تورکیا یەکەم ولاتی ئیسلامی بوو ، دوای چەند مانگیك لە دامەزرانی ئیسرائیل لەسالی (١٩٤٨) دانی بە ئیسرائیل نا . بی شك ئەم دانپیانانەش ، مانای زیاتر خو دوورخستنەوە دەگەیەنی لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامی . کە وای کرد مەحال بی

پەیوەندییەکانی تورك و عەرەب باشتر بن، بەلکو تەگەرەکانی زیاتر کرد.

* مەرجی بەریتانیاش بو وەرگرتنی تورکیا لەنیو هەردوو پەیمانی ناتوو بازاری هاوبەشی ئەورووپا، ئەوە بوو، کە دەبیت تورکیا لە روژهەلاتی ناوەراست و روژهەلاتی ئەورووپا. بە راسپاردەی ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا، چەندین ئەلقەی تری پەیمانی ناتو لەو ناوچانەدا پیك بهینیت، بو زیاتر گەمارودانی یەکیتی سوڤیەت وەك ریکخراوی سەرکردایەتی ناوەراست (سانتوو پەیمانی بەلقان). جگە لەوە ئەمریکاو ئەورووپا مەبەستی سەرەکیان لە سازدانی پەیمانی (سانتو) پەلکیش کردنی (میسر) بوو. چونکە (میسر) شوینیکی ستراتیجی هەیە بو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و ئەورووپا لە دەریای سپی ناوەراستدا. بو ئەوەی (میسر) بکریتە بنکەیەکی سەربازی گرنگی (سانتو)، تایبیتە پاشکوی پەیمانی ناتو لە ناوچەکەدا. هەروەها لە لایەن تورکیاو ئەورووپا و ئەمریکاوە هەمان گوشاریش خرایە سەر سوریا، تائەویش بخزیتە نیو ئەو پەیمانە بەلام لەبەر ئەو هویانەی پیشتر باسمان کردن، سوریا و میسر بە هیچ شیوەیەك ملیان نەدایە دەست ئەو گوشارانە.

جیا لەبەر روشنایی ئەو هوکارانەی سەرەوەو، گەشەسەندنی بزاڤی رزگاریخوازی عەرەبی بە سەرکردایەتی (جەمال عەبدولناسر)، روژ بە روژ ناکوکیەکانی نیوان عەرەبە ناسیونالیستەکان و ئەمریکا و ئەورووپا لەلایەك و تورکیاش لە لایەکی ترەوە قوولتر دەبوونەوە. بەلکو ئەم شیوە مامەلەیەی ئەورووپا و ئەمریکا کاردانەوەیەکی نیگەتیفی لە لایەن عەرەبەکانەوە هەبوو. بەتایبەتی دوای ئەوەی لە سالی (١٩٥٦) ئیسرائیل بە پالپشتی بەریتانیا و فەرەنسا و بەهاریکاری ئەمریکا (دەست دریژی سی لایەنە ــ العدوان الثلاثي)یان کردە سەر میسر، ئەمەش وای لە سوری و میسریەکان کرد. لە سالی (١٩٥٨) یەکیتی هەردوولا رابگەیەنن، بو دژایەتی کردنی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لەلایەك و هەلوەشاندنەوەی قەوارەی زایونیزم لەلایەکی تر. جگە لەوە دوای شورشی (١٤ تەموزی ١٩٥٨) عیراقیش ئەندامیەتی خوی لە نیو (سانتودا) کشاندەوە.

بەلام لە دوای سالی (١٩٦٤)ەوە واتە دوای کیشەی قوبرس، تورکەکان هەروەك پیشتر ئامازەمان بو کردن. هەستیان بەو کەلینە دبلوماسیە کرد. بویە لەو سالەوە بەدواوە تورکەکان هەولی جدییانەیان دا بو دارشتنەوەی پەیوەندییەکانیان لەگەل ولاتانی عەرەبی ئیسلامی. سەرەتا تورکیا بو دەرخستنی نیازپاکی خوی لە دارشتنەوەی ئەو پەیوەندییانە. لایەنگیری عەرەبەکانی کرد لە شەری (١٩٦٧) دژ بە ئیسرائیل. کاتی ئیسرائیل هیرشی کردە

سه ر میسر و ئوردون و سوریا . به لكو توركیا بو زیاتر خو ره پیش كردن له عه ره به كان . په یوه ندییه بازرگانیه كانی خوی له گه ل ئیسرائیلدا به شیوه یه كی كت وپر كه م كرده وه . بو نموونه له سالی (١٩٦٨) نرخی ئه و كه ل وپه لانه ی له ئیسرائیله وه ده گه یشته توركیا خوی له (٣،٦) ملیون دولار ده دا ، كه چی سالیك پیشتر خوی له (٥،٧٤) ملیون دولار ده دا . هه روه ها نرخی ئه و كه ل وپه لانه ی له سالی ١٩٦٧ له توركیاوه ده گه یشتنه ئیسرائیل خوی له (٢،٦) ملیون دولار ده دا ، كه چی له سالی ١٩٦٨ بو (١،٩٧) ملیون دولار كه م كرایه وه . به لكو توركیا به وه ش نه وه ستا . له سالی (١٩٦٩) گشت په یوه ندیه بازرگانیه كانی خوی له گه ل ئیسرائیل راگرت . دوابه دوای ئه وه توركیا بو زیاتر پته وكردنی ئه و په یوه ندیانه له گه ل وولاتانی عه ره بی و ئیسلامی بو یه كه م جار له سالی ١٩٦٩ به شداری راگرت . دوابه دوای ئه وه توركیا بو زیاتر پته وكردنی ئه و په یوه ندیانه له گه ل وولاتانی عه ره بی و ئیسلامی بو یه كه م جار له سالی ١٩٦٩ به شداری كونگره ی وولاتانی ئیسلامی كرد . هه روه ها توركیا له سالی ١٩٧٦ به ره سمی پیشوازی له وه فدیكی ریكخراوی ئازادی خوازی فه له ستینی كرد و به نوینه ری راسته قینه ی فه له ستینیه كانی له قه له م دا .

مه به ستی توركیاش له په یره وكردنی ئه م جوره سیاسه ته له گه ل ئیسرائیل دوو لایه نی به خو وه گرتبوو .

* لایه نی سیاسی ، سه رنج راكیشانی عه ره به كان به لای خوی دا .
* لایه نی ئابووری ، توركیا ولاتانی عه ره بی به ئه لته رناتیڤیك بو ئه و ده سكه وته ئابووریانه ی كه له ئیسرائیل به ده ستی ده هینا داده نا .

بی شك ئه م هه نگاوه پوزه تیڤانه ی توركیا ، هه روا بی سوود نه بوو ، به لكو بووه مایه ی خوشحالی وولاتانی عه ره بی بویه ش سه یر ده كه ین له دوای ئه م هه نگاوانه ی توركیا ، په یوه ندییه ئابوری و ئه منیه كانی نیوان توركیا و عیراق له لایه ك و په یوه ندییه ئابوورییه كانی نیوان توركیا و سعودیه و لیبیا و ولاتانی كه نداو و یه مه ن و جه زائیر و تونس و سودان و موریتانیا فراوانتر بوو .

به لام ئه وه ی جیگای سه رنج بیت . ئه م په یوه ندییه ئابووریانه ی نیوان ولاتانی عه ره بی و توركیا . تاسالی ١٩٧٩ مایه ی گومانی عه ره به كان بوو ، له به رئه وه ی تا ئه و كاته توركیا هیشتا یه كه م ولاتی ئیسلامی بوو دانی به بوونی ئیسرائیلدا نابوو . به لام دوای ئه وه ی میسر له سالی ١٩٧٩ په یمانی (كامب دیڤید)ی له گه ل ئیسرائیلدا موركردو ، به ره سمی دانی به ده وله تی ئیسرائیلدا نا ، توركیا له و كاته وه به دواوه باریكی گونجاوتری بو ره خسا كه بتوانی ئه و گومان و رارایییه ی له نیو ولاتانی عه ره بی دا هه یه به رامبه ری كه م تر بكاته وه و خوی له

گوشاره‌کانیان ده‌ربازبکاو په‌یوه‌ندییه‌کانی خوی له‌گه‌ل ئه‌و ولاتانه زیاتر دابکوتی و پته‌وتریان بکات. هه‌ربویه ده‌بینین له‌ هه‌شتاکانی ئه‌و سه‌ده‌یه‌دا، په‌یوه‌ندییه‌ ئابوورییه‌کانی نیوان تورك و عه‌ره‌به‌کان. به‌ره‌و ئاقاریکی باشتر هه‌نگاو ده‌نی و روژ به‌روژ ئه‌و په‌یوه‌ندییانه‌ په‌ره‌ده‌سینی و گه‌شه‌ بکات. جا لیره‌دا بومان ده‌رده‌که‌ویت که‌ کیشه‌ی ئیسرائیل. تاکه‌ به‌ربه‌ست بوو له‌به‌رده‌م په‌لکیش کردنی تورکیا بو ناوچه‌که‌. به‌تایبه‌تیش له‌ روژگاریکی وه‌ك ئه‌مرودا. که‌ کیشه‌ی عه‌ره‌ب و ئیسرائیل روو له‌ چاره‌سه‌رکردن ده‌کات و یه‌که‌ یه‌که‌ی ولاتانی عه‌ره‌بی یه‌ك له‌ دوای یه‌ك دان به‌ بوونی ئیسرائیل دا ده‌نین هه‌ر بویه‌ ئه‌ تورکیا له‌و پیودانگه‌وه‌، ده‌یه‌ویت زیاتر جیگا پی ی خوی له‌ ناوچه‌که‌ قایمتر بکات. تا له‌و ریگایه‌وه‌ پروژه‌ ئابوورییه‌کانی خوی گه‌شه‌ پی بدات و ئه‌و ده‌سکه‌وته‌ ئابوورییانه‌ی له‌ لایه‌ن عه‌ره‌به‌کانه‌وه‌ پی ی ده‌گات. وه‌ك ئه‌لته‌رناتیڤیك جیگای یارمه‌تیه ئابووری و عه‌سکه‌رییه‌کانی ئه‌مریکا و ئه‌ورووپا بگریته‌وه‌. ئه‌مه‌یان له‌ لایه‌ك، له‌ لایه‌کی تره‌وه‌ تورکیا ده‌یه‌ویت له‌روانگه‌ی ئه‌م گورانکارییانه‌ی له‌ ناوچه‌که‌دا روویان داوه‌ و رووده‌ده‌ن. دووباره‌ په‌یوه‌ندییه‌ ئابووری و ئه‌منیه‌کان و عه‌سکه‌رییه‌کانی خوی له‌گه‌ل ئیسرائیل، ببوژینیته‌وه‌. چونکه‌ تورکیا وا مه‌زه‌نده‌ ده‌کات ئیستا باره‌که‌ زور له‌باره‌ بو چوونه‌ نیو ئه‌و ناوچه‌یه‌. بو ئه‌وه‌ی بتوانی له‌ ریگای بازاره‌کانی ولاتانی عه‌ره‌بی و ئیسرائیل گه‌شه‌ به‌ سه‌رمایه‌کانی خوی بدات و کالاو سه‌رمایه‌ی نوی‌تر به‌ده‌ست بهینی. هه‌روه‌ها له‌و ریگایه‌شه‌وه‌ بتوانی چاره‌سه‌ری بیکاری له‌ ولاته‌که‌یدا بکات. به‌تایبه‌تی دوای په‌ره‌گه‌ رخستنی کریکاره‌ تورکیه‌کان له‌و پروژانه‌ی که‌ له‌م ولاتانه‌ ئه‌نجامی ده‌دات. جگه‌ له‌وه‌ تورکیا ده‌یه‌ویت له‌ په‌راویزی پروسه‌ی ئاشتی له‌ روژهه‌لاتی ناوه‌راستدا وه‌ك لایه‌نیك له‌ کیشه‌که‌ ئه‌ویش له‌ ده‌سکه‌وته‌ ئابووری و سیاسیه‌کان قازانجی ده‌ست که‌ویت. به‌تایبه‌تی له‌م ماوه‌یه‌دا له‌ شاری (رباط)ی پایته‌ختی مه‌غرب، کونگره‌یه‌کی فراوان سازدرا، بو دروست کردن و دامه‌زراندنی بانقیکی ئابووری له‌ ناوچه‌که‌، بو بوژانه‌وه‌ی روژهه‌لاتی ناوه‌راست.

## ئایا ئه‌و هه‌ولانه‌ی تورکیا سه‌رده‌گرن ؟!

هه‌روه‌ك له‌ پیشتر ئاماژه‌مان بو کرد. تورکیا وامه‌زه‌نده‌ ده‌کات، ئه‌گه‌ر بتوانی په‌یوه‌ندییه‌کی ئابووری پته‌و له‌گه‌ل ولاتانی عه‌ره‌بی دابمه‌زرینیت و سه‌رمایه‌و کالاو بازاری نوی بو ساغ کردنه‌وه‌ی که‌ل و په‌له‌کانی به‌ده‌ست بهینی، تا راده‌یه‌ك ده‌توانی کیشه‌ی کورد له‌ کوردستانی باکوور چاره‌سه‌ر بکات. چونکه‌ تورکیا وابو کیشه‌که‌ چووه‌، ئه‌مرو کیشه‌ی کورد له‌ کوردستانی باکوور له‌

نه نجامی باری خرایی گوزه رانی دانیشتوانی ناوچه که و نه بوونی پرۆژه ی ئابووری له ناوچه کوردنشینه کاندا، ته شه نه ی کردووه. جا ئه گه ر بیت و ئه م ناوچه یه له رووی ئابووریه وه گه شه بکات و کارو بژیوی ژیانی کورده کان چاکتر بکات و له پال ئه وه ش دا، هه ندی مافی روشنبیری و نه ته وه یی بو کورده کان ده سته به ر بکات. ئه وا ده توانی (٨٠٪) کیشه که چاره سه ر بکات. به لام ئه گه ر تورکیا وابیربکاته وه و وا مه زنده بکات. ئه مه یان غه فله ت زه ده یی تورکه کان ده رده خا به رامبه ر چونیه تی چاره سه ر کردنی کیشه یه کی گرنگی وه ك کیشه ی کورد له ولاته که یدا. چونکه کوردستانی عیراق باشترین به لگه یه بو ره ت کردنه وه ی ئه م جوره چاره سه ر کردنه ناکامله.

هه رچه نده رژیمی عیراق دوای هه ره س پیهینانی شورشی کورد له سالی (١٩٧٥)، هه ولی دا باری گوزه رانی کورده کان باشتربکات و چه ندین پرۆژه ی خزمه تگوزاری و پیشه سازی له ناوچه که دا ده سته به ر بکات. به لام ئه م هه ولانه ی رژیمی عیراق نه بوونه مایه ی چاره سه رکردنی کیشه ی کوردستانی باشوور. به لکو ئه مجاره یان بزافی رزگاریخوازی گه لی کورد له عیراق، به ئامرازی نوی ترو بیرکردنه وه ی نوی تر سه ری هه لدایه وه. خه لکی کوردستانیش له جاران هوشیارتر داوای مافه ره واکانی خویان ده کرد.

جا لیره دا پیویسته تورکیا و گشت ئه و ولاتانه ی کوردستانیان به سه ر دابه شکراوه چاك ئه و مه سه له یه بگه ن، که کیشه ی کورد کیشه یه کی ئابووری یاروشنبیری یاکومه لایه تی نی یه. به لکو کیشه ی بوونی نه ته وه یه که. ئایا هه بیت یان نا!! به تایبه تی دوای ئه و گورانکارییانه ی به سه ر سیسته می سیاسی جیهاندا هاتن. ده بی تورکیا چاك له و نه زمه نوی یه ی جیهانی ئه مرو بگات. که ئه م سیسته مه خوی له خویدا، سیسته می رزگاربوونی نه ته وه چه وساوه و بی مافه کانی جیهانه. که ماوه ی (٧٠) سالی ره به ق به هوی بلوك به ندیه تی جیهان، ده نگی ئه م نه ته وانه خه فه کرابوون.

ئه گه ر تورکیا بیه ویت خوی له گوشاره کانی ئه مریکا و ئه ورووپا ده ربازبکات و به ره و روژهه لات په ل بهاویت. پشت به پارمه تیه کانی ئه و دوولایه نه نه به ستیت و له جیاتی ئه و پارمه تیانه، سه رمایه و کالای ئابووری بو بوژاندنه وه ی باری ئابووری خرایی تورکیا له ولاتانی عه ره بی به ده ست بهینی. ئه مه یان کاریکی مه حاله و هه رگیز تورکیا تیایدا سه رکه وتوو نابیت. له به ر ئه م هویانه :ـ

* تورکیا ولاتیکی کشتوکالیه و پیشه سازییه که شی پیشه سازییه کی کشتوکالیه، ئه گه ر پیشه سازی قورسیشی هه بیت، زیاتر پیشه سازییه کی کوکردنه وه یی یه (تجمیع)ه. چونکه زوربه ی که ره سه خاوه کانی ئه و

پیشەسازی یەو پیشەسازیە کشتوکالیەکەی، پشت بە (تەکنەلوجیای) ئەمریکایی و ئەوروپایی دەبەستیت. بویە تورکیا ناتوانی ببیتە جەمسەریك بو کوکردنەوەی ولاتانی عەرەبی لەدەوری خوی. هەروەها کەم وزەیی تورکیاش هویەکی ترە کە نەتوانی ببیتە مایەی وەدەستهینانی سەرمایەکی زور. بو نموونە لەسالی ١٩٦٨ کەلوپەلە کشتوکالیە نیردراوەکانی تورکیا بو دەرەوە، ریژەی (٨٤,٧)ی لە پروسەی بازرگانی دەرەوەی تورکیا داگیرکردبوو!!

* تورکیا بو بەگەرخستنی ئابوورییە داتەپیوەکەی، پیویستی بە سەرمایەی بیانی هەیە کە بەشیوەی (استثمار) لەناو ولاتەکەیدا کاربکات. تابیتە پالپشتیك بو بەگەرخستنی بوارە ئابوورییە گرنگەکان کە دەولەتی تورکیا پیویستیەتی. تاکە ولاتیك لەنیو عەرەبەکان، ئەو توانایەی هەبی، ولاتی سعودیەیە. بەحوکمی ئەوەی ئەمرو سعودیە یەکیکە لەو ولاتە ئیسلامیانەی داوای رابەرایەتی بزووتنەوەی ئیسلامی سونیەکان دەکات لەناوچەکە. بو ئەم مەبەستەش پشتگیری لە جولانەوەی ئوسولیەکانی جیهان دەکات. تورکیاش ولاتیکی ئیسلامی سونیە، بویە تورکیا بە هیچ شیوەیەك ریگا بە سعودیە نادات لەناو تورکیا لە بال خستنەگەری سەرمایەکەی. پشتگیری لە ئوسولییەکانی تورکیا بکات. هەموو لایەکیشمان چاك دەزانین بزووتنەوەی ئوسلییەکانی نیو تورکیا لە چ گەشەکردنیك دایە.

* هەروەها تورکیا ناتوانی، بازارەکانی ئەوروپا پشت گوی بخاو پەیوەندییە ئابوورییەکانی لەگەل ولاتانی ئەوروپای روژئاوا کەم بکاتەوە. بە چاویکی گرنگ نەروانیتە ئەوروپای یەکگرتووی دوا روژ. چونکە ئەگەر بیت و سەیری رادەی پەیوەندییە بازرگانی و ئابوورییەکانی نیوان تورکیا و ولاتانی ئەوروپای روژئاوا بکەین. بومان دەردەکەویت ئەمریکاو ئەوروپا بازاریکی سەرەکی تورکیان بوساغکردنەوەی کەلوپەلە بەرهەمهیتراوەکانی و هینانی کەرەستەی پیویست و کەرەستەی خاو.

هەروەك لە خشتەی بازرگانی تورکیا لەگەل ولاتانی جیهان دا دەردەکەویت، کە پروسەی بازرگانی دەرەوەی تورکیا زیاتر لەگەل ولاتانی پیشەسازی وەك ئەلمانیا و ئیتالیا و سویسرا و ئەمریکای روژئاوایە. ئایا دەچیتە عەقلی هیچ کەسیك کە تورکیا بتوانی دەستبەرداری ئەم بازارانە بیت؟! بەتایبەتی باری ئابووری تورکیا لەژیر دەیان قەیران منالیتی؟! ئایا تورکیا دەتوانی وا بە ئاسانی گرنگی ئەو ولاتانە پشت گوی بخاو، گوشارەکانی ئەو ولاتانە بە هەند هەلنەگریو گویرایەلی راسپاردەو پیشنیارەکانیان نەبیت؟!

* تورکیا بەپیی وابەستەیی بە سیاسەتی ئەمریکاوە. لە یاداشتی ئەو

خوگریدانه ش به ئه مریکاوه. ئه مریکا سه رچاوه یه کی هه ره گرنگی یارمه یته ئابووری و عه سکه ریه کانه بو تورکیا . ئه و یارمه تیانه ش تاراده یه کی زور گری که ره وه ی قه یرانه سیاسی و ئابووریه کانی دوینی و ئه مروی تورکیایه . هه ر بو نموونه هه ندیك ریژه ی ئه و یارمه تیانه ی که زانراون ده خه ینه به رچاوتان .

* تورکیا له نیوان سالانی (١٩٤٨ ــ ١٩٥٣) له چوارچیوه ی پروژه ی مارشال بو ده سته به رکردنی یارمه تیه ئابووریه کانی ئه مریکا . نزیکه ی (٢٢٥) ملیون دولاری وه رگرت .

* هه روه ها له چوارچیوه ی پروژه ی ترومانیش بو ده سته به رکردنی یارمه تیه سه ربازیه کان تورکیا نزیکه ی (٣٠٥) ملیون دولاری له ئه مریکا وه رگرت .

* له نیوان سالانی ١٩٨٠ــ ١٩٨٥ تورکیا نزیکه ی (٢٢٥٠) ملیون دولاری تری وه ك یارمه تی سه ربازی و ئابووری له ئه مریکا وه رگرت .

* له سالی ١٩٨٦ تورکیا . (٩٣٩) ملیون دولاری وه ك یارمه تی ئه منی له ئه مریکا وه رگرت .

* هه روه ها له ١٦ ئازاری ١٩٨٧ تورکیا و ئه مریکا، په یمانی هاریکاری عه سکه ری نیوان هه ردوولایان نوی کردووه . به گویره ی ئه و په یمانه تورکیا تا ١٨ کانونی ١٩٩٠ (٦١٥) ملیون دولاری تر له ئه مریکا وه رده گری .

ئه مه جگه له و یارمه تی و کومه کانه ی، په یمانی ناتو پیشکه شی تورکیای کردووه. سه ره رای ئه وه ش ئامیرو ماشینی جه نگی چه ك و یه ده گه کانی سوپای تورکی ، سه رچاوه سه ره کیه که ی جبه خانه کانی ئه مریکا و ئه ورویایه .

ئایا به بی ئه و یارمه تی و کومه که ئابووری و سه ربازیانه ی ئه مریکاو ئه ورویا ، تورکیا ده توانیت به و شیوه یه و قه باره سیاسه ی ئیستای هه یه بمینیته وه ؟ ئایا به بی چه ك و جبه خانه ی جه نگی ، تورکیا ده توانی جه نگ دژی کورده کان به ریابکات ؟

* هه روه ها تورکیا ، به پی ی ئه و ئامارانه ی له به رده ست دان ، قه رزیکی زوری ولاتانی ئه ورویا و ئه مریکا و کومپانیا و بانق و ریکخراوه کانی بوژانه وه ی جیهانی . لا که له که بووه . ئه و قه رزانه ی دراونه ته تورکیا . هه روه ك باوه به قازانج ده دریته ولاتان . بو نموونه له سالی ١٩٨٣ ریژه ی ئه و قه رزه دریژخایه نانه ی دراونه ته تورکیا خوی له (١٦,٧) ملیار دولار ده دا. هه روه ها قه رزه کورت خایه نه کانی هه مان سالیش (٢,٨) ملیار دولار بوو . ریژه ی قازانجی هه ردوو جوره قه رزه که ش (٥,٧) ملیار دولار بوو ! ! کوی هه ردوو جور قه رزه که و قازانجه که ی ده کاته (٢٣,٤) ملیار دولار. که چی قه رزه کانی سالی (١٩٩٠) ی تورکیا ده گاته (٤٣)* ملیار دولار. ئیمه لیره وه ده پرسین ، ئه گه ر (١٩,٥) ملیار دولار له سالی ١٩٨٣ به قازانجی

## خشتەی بازرگانی تورکیا لەگەڵ وڵاتانی جیهان

| کۆمەلەی وڵاتان | نێردراو بەرێژەی ٪ ١٩٧٩ | نێردراو بەرێژەی ٪ ١٩٨١ | نێردراو بەرێژەی ٪ ١٩٨٣ | نێردراو بەرێژەی ٪ ١٩٨٤ | هێنراو بەرێژەی ٪ ١٩٧٩ | هێنراو بەرێژەی ٪ ١٩٨١ | هێنراو بەرێژەی ٪ ١٩٨٣ | هێنراو بەرێژەی ٪ ١٩٨٤ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| وڵاتانی پیشەسازی رۆژئاوا | ٦٤ | ٤٨ | ٤٨ | ٥٢ | ٦١ | ٤٨ | ٤٩ | ٥١,٦ |
| = رۆژهەڵاتی ناوەراستو باکوری ئەفریقیا | ١٨ | ٤١,٢ | ٤٥ | ٣٧ | ٢٢,٤ | ٤٠ | ٢٩ | ٢١,٦ |
| = ئەوروپای رۆژهەلاتو سۆڤیەت | ٥,٦ | ٤,٢ | ١,٥ | ٢,٩ | ٢,١ | ١,٨ | ٢,٥ | ٨,٧ |
| وڵاتانی دیکە | ١٢,٤ | ١٦,٥ | ٥,٥ | ٧,١ | ١٤,٥ | ١٠,٢ | ٩,٥ | ٨,١ |
| کۆی بەرێژەی ٪ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ | ١٠٠ |

**(٥.٧) ملیار دولار درابیتە تورکیا . ئایا (٤٣) ملیار دولار، ئیستا قازانجەکەی چەندە ؟!**

**هەروەها ئەو پرسیارانەش لێرە سەر هەڵدەدەن. ئایا تورکیا دەتوانی بە پێچەوانەی ئیلتیزامی ئەو جورە قەرزانە مامەڵە بکات ؟ ئایا هەڵویستی قەرز دەرەکان چی دەبی کاتی سەرمایەکەیان بکەویتە مەترسی و نەتوانن لە ماوەی دیاریکراوی خویدا قەرزەکانیان وەربگرنەوە ؟ ئایا بە دواکەوتنی قەرزەکان لە ماوەی دیاریکراوی خویدا، تورکیا دەتوانی، قازانجی تر بژمیری ؟!**

---

## سەرچاوەکانی هەر حەوت بەشەکە


١ ـ تركيا المعاصرة تأليف نخبة من الاساتذة الباحثين في جامعتي الموصل وبغداد ١٩٨٨ مطبعة جامعة الموصل

٢ ـ السياسة الخارجية التركية بعد الحرب العالمية الثانية. احمد نوري نعيمي. رسالة ماجستير ١٩٧٥ بغداد.

٣ ـ تركيا الجارة الشمالية. مديرية الامن العامة العراقية. مطبعة نفس المديرية. تداول محدود. سري.

٤ ـ مسائل الثورة في العالم الثالث. الامبريالية والنموذج التركي اد. حكمت قفلجميلي. ترجمة فـ ـلقمان الطبعة الاولى. دار الحداثة ـ بيروت.

٥ ـ تركيا و الحلف الشمال الاطلسي. د. احمد نوري النعمي. المطبعة الوطنية. الاردن. ١٩٨١.

6_* The MILITRY BALAWEE -1991-1992.


• لە نامیەکی جەلال تالەبانی دا بو ئوجەلان. پیش ئاگربەستی لایەنەی پەکەکە لەگەل تورکیا.

# فەهرەست

بابەتی یەکەم

تورکیا لە دووریانی دەسەلاتی ژەنەرالەکان و دەسەلاتی سیاسییەکاندا..........................................ل ٧ـ ٥٦

بابەتی دووەم

کێشەی کورد وەك کێشەی قوبرس، ڕۆژهەلات دەکاتە گۆرەپانی تەڕاتێنی دیبلۆماسییەتی تورکیا....................ل ٥٧ـ ٨٦

